حکومەتی هەرێمی کوردستان — عێراق

وەزارەتی پەروەردە

بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان




## بۆ پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی و بازرگانی

دانـــان

د.محمد سلمان محمد

پێداچوونەوەی زانستی

د.زکی حسین قـــادر        عمر علی شریف

چاپی نۆیەم    ١٤٣٧ کۆچی    ٢٠١٦ زایینی    ٢٧١٦ کوردی

## بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

پێشەکی

هاوشان لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی سەرجەم بوارەکانی ژیانی لە هەرێمی کوردستان گرتۆتەوە، خەریکە روو لە باشترکردنی لایەنەکانی ژیان دەکا، و بەرفراوانکردنی رۆشنبیری کە هەنگاوێکی ئەم کاروانەیە، پێویستە گۆڕانیش لە پرۆگرامەکان و سیستەمی خوێندن بکرێ، تا بگاتە ئاستی پەرەسەندنی هزری جیهانی و تاوەکو لەو گۆڕانە بە خێرایەی جیهان و بە جیهانیبوون دانەبڕێن و لە چەمکی ئازادی بازاڕ بێ بەش نەبین، لە سەر راسپاردەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان — لیژنەیەکی پسپۆر لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان هەڵساون بە دانانی ئەم کتێبە. لە دانانی ئەم پەرتووکەدا رەچاوی ئەوە کراوە کە بەشی یەکەمی دووبارەکردنەوە و بەرەوپێشبردنی ئەو بیروبۆچوون و بابەتانە بێت کە لە پۆلی دەیەمی وێژەیی و پیشەیی خوێندراون، وبەشەکانی دیکەش بگونجێن لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی ئەم قۆناغەی خوێندن، و لەگەڵ ئەم ئامانجانە:

— تێگەیشتن و ئاسۆی بیری فێرخوازان لە بواری ئابووری فراوانتر بکات.

— سیاسەتی پەروەردەیی لە هەرێمی کوردستان دەیەوێ گۆڕانکاری لە زانستی پەروەردەیی بەدی بێنێ، ئەو گۆڕانەش هاوشانی ئەو پەرەسەندنانە بێت کە بانگەشەی بۆ دەکرێ.

سەرباری ئەوەش لەگەڵ ئەو رەوشە هزرییەی ئەمڕۆ لە جیهاندا هەیە بە تایبەتی لە بوارەکانی ئابووریدا، بۆ ئاراستەکردنی بەرەو ئابوورییەکی ئازاد، و رێکخستنەوەی کەرتی گشتی و جیهانگیری و میکانیزمەکانی، هەرچی لەم پەرتووکەدا هاتووە بەشێوەیەك بەیەکەوە بەستراوو هاوگونجانێك

لەنێوان بابەتەکاندا دانراوە تاوەکو بگونجێ لەگەڵ ئاستی زانستی و بیری قوتابیان.

هیوادارم ئەم پەرتووکە دەستپێکی بەسوود بێت کە لە لایەن پسپۆرانی کوردەوەپێشکەش بە فێرخوازان و پرۆسەی خوێندن دەکرێ، و بەشدارییەکی چاك بێت لە بەرەو پێش بردنی پرۆسەی پەروەردەو رۆشنبیریی کوردستان و گەشەپێدانی بواری زانستی بۆ ئەوەی لە ئاستی گۆڕانکارییەکانی جیهان بێت.

لەکۆتاییدا ئومێد دەکەین لەم کارەمان سەرکەوتوو بین و خزمەتێکمان گەیاندبێتە پرۆسەی خوێندن، سوپاسی هەموو ئەو کەسانەش دەکەین بە رەخنە و پێشنیاری بەجێ و بونیادنەر و تێبینی خۆیان لەسەر پەرتووکەکە دەردەبڕن، لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کەمتر کردنەوەی هەڵەکان وکەموکورییەکان...پەنا بەخوا.

دانەر

# بەشی یەکەم

## پێداچوونەوەیەکی گشتی

## REVIEW

### یەکەم:

### پێناسـەی زانـستی ئـابووری و پەیوەنـدی بـە زانـستەکانی دیکـە و گرنگییەکەی:

#### ١. پێناسەی زانستی ئابووری

#### The Defination of Economics

زانستی ئابووری (Economics) یەکێکە لـە زانستە کۆمەڵایەتییـەکان کە بە شێوەیەکی سەرەکی بایەخ بـەو ڕێگایانـە دەدات کـە کۆمـەڵگا دەست نیشانی دەکات بۆ بەکارهێنانی سەرچاوە سنووردارەکانی، کە بەکارهێنانەکی شـوێنگرەوەی هـەبێت بـۆ بەرهـەمهێنانی شمـەك و خزمەتگوزارییـە بەکاربراوەکانی ئێستا وئایندە.

– لێرەدا پرسـیارێك دێتـە پێشەوە کـە ئـاخۆ ئـابووری زانستە یـان هونەر؟

– زانست بریتییە لە کەڵەکەبوون و پۆلین و ڕێکخستنی زانیارییەکان بۆ دۆزینەوەی بنەما سەرەکییەکان و کاری یاساکان.

– بـەڵام هونـەر ئامـاژە کردنـە بـۆ توانـاو وکارامـەیی جێبـەجێکردنی ئەرکـەکان یـان پیـادەکردنی شـێوازێك. بۆیـە ئـابووری بایـەخ دەدات بـە پێشکەوتنی زانـستیانەی بنـەماکانی ئـابووری و پیـادەکردنی چـۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی کە لە واقعیدا هەن. بـە واتایـەکی تـر ئـابووری زانست و هونەرە، و لەبەر ئەوەی لەگەڵ چالاکییەکانی کۆمەڵگە دەکات، بۆیـە

زانــستێکی کۆمەڵایەتییە و پەیوەنــدی بــە زانــستەکانی کۆمەڵایــەتی و ڕەفتارییەوە هەیە وەك زانستەکانی مێژوو ڕامیاری و زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناسی.

زانستی ئابووری پێناسەی زۆرە، ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

- ئەو زانستەیە لە دابەشکردنی دەرامەتە دەگمەنەکان لەنێوان بەکارهێنان و ئامانجە جۆربەجۆرەکاندا دەکۆڵێتەوە.
- لێکۆڵینەوە دەکات لەبارەی ڕەفتاری مرۆڤ لە میانەی ئەنجامدانی چالاکیەکانی ژیانی ڕۆژانەی بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی بەئامانجی هێنانەدی خۆشگوزەرانی.
- زانستێکە لەشێوازی زیادکردنی بەرهەمهێنان دەکۆڵێتەوە بە ئامانجی چاك کردنی ئاستی بژێوی.

ئەم پێناسانەی سەرەوە هەر یەکێکیان ئاماژە بۆ بارێکی دیاریکراو دەکەن، بەڵام هەر هەموویان پێکەوە ئەوە نیشان دەدەن کەوا زانستی ئابووری:

أ — زانستێکە گرنگی دەدات بە دەرامەت و دەگمەنیەکەی. ئەم دەرامەتە دەگمەنانەش هەموو پێداویستیەکانی مرۆڤ پڕ ناکەنەوە. بۆیە پێویستە کۆمەڵگە دەست بەو دەرامەتانەوە بگرێت و ئابووریناسان گرنگی بەو شوێنگرەوانە (Alternatives) دەدەن لەجیاتی ئەم دەرامەتانە بەکار دەهێنرێن و دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەی کە کۆمەڵگە لەکۆتاییدا هەڵیاندەبژێرێ بۆ بەکارهێنانی ئەو دەرامەتانەی ڕەخساوانەی هەیە.

ب – هەروەها ڕێگە بە تاكەكان دەدات سەربەست بن لە چۆنیەتی دابەشكردنی و بەكارهێنانی دەرامەتەكان، بۆیە پێویستە لەسەریان ئەو شمەكانە هەڵبژێرن كەدەبێ بە داهاتەكانیان بیكڕن. چۆنیەتی بەكارهێنانی كاتەكانیان و ژمارەی منداڵەكانیان و شتی دیكە.

ج– بوار بۆ ئابووریناسان دەڕەخسێنێ كە گرنگی بەو ڕێكخراوە ئابوورییە جیاوازانە و بایەخ بە ڕۆڵی حكوومەت بدەن لە ئابووریدا لەژێر سایەی سیستەمە جیاوازەكان.

## ٢. پەیوەندی زانستی ئابووری بە زانستەكانی ترەوە:

زانستی ئابووری هەروەك لە پێشتر ئامارەی پێدرا زانستێكی كۆمەڵایەتییەو لە گەشەسەندنیدا پشتی بەستووە بە زانستە رووتەكان(العلوم الصرفة).

بەم شێوەیەی خوارەوە باس لە پەیوەندی زانستی ئابووری لەگەڵ هەندێك زانستی تردا دەكرێت :

### أ– پەیوەندی ئابووری بە مێژووەوە

مێژووی ڕووداوە ئابوورییەكان لە رابردوودا ڕێگە خۆشكەر بووە لە بەردەم توێژەرە ئابوورییەكان بۆ لێكۆڵینەوە لە ڕووداوە ئابوورییە هاوچەرخەكانداو لەكاتی لێكۆڵینەوە لەبارەی مێژووی ئابووری و ئاگاداربوون لەسەر ئەو پەرەسەندنە ئابووریانەی كە لە رابردوودا هەبووە، ئەوا دەتوانین لە چۆنیەتی دیاردەی ئابووری هاوچەرخ تێبگەین.

### ب- پەیوەندی ئابووری بە زانستی رامیارییەوە:

رامیــاری هونــەری حوکمڕانییــە. یــاخود ئامرازێکــە بــۆ رێکخــستنی پەیوەندییــەکانی نێــوان دەوڵــەت و هاووڵاتیــان (نێــوان دەســەڵاتداران و بــێ دەسەڵاتان). راو بۆچوونی هەندێك لە بارەی ئابوورییەوە ئەوەیە کەوا ئابووری پێویستە لە خزمەتی رامیــاری دابێــت، واتــا ســامانی نەتــەوەیی و جموجــۆڵی ئــابووری پێویــستە لــە خزمــەتی دەســەڵات دابێــت، تــاوەکو لەسەرەتاشــدا پێناســەی ئــابووری بــە ( زانــستی ئــابووری رامیــاری ) کــراوە. ئــەم بەیــەك بەســتنەوەی ئــابووری بــە رامیاریــەوە بەڵگەیــەکی روونــە لەســەر پەیوەنــدی پتەوی رامیاری بە ئابوورییەوە.

### ج- پەیوەندی ئابووری بەزانستی دەروونناسییەوە:

پاڵنەرە دەروونییە شاراوەکان رەفتارەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن، بەڵام ئابووریزان بایەخ بە زانینی چۆنیەتی رەفتــاری تــاك دەدات لــە خــەرجکردن و هەڵبژاردنی شتەکاندا، بۆیــە پێویــستە پــشت ببەســترێت بــە دەروونناســی لــە پێناو شیکردنەوەی رەفتاری ئادەمیزاد (مرۆڤ) لــە چــالاکییە ئابوورییــەکان و پێشبینیکردن لە رەفتارەکانی ئایندەدا، بۆ نموونە هۆکارە دەروونییەکان کار دەکەنە سەر بەرهەمهێنانی کار و توانای لە بەشداریکردن لــە بەرهەمهێنانــدا. بۆیە دەتــوانین بڵــێین پەیوەندییــەکی بــەهێز هەیــە لــە نێــوان دەروونناســی و زانستی ئابووریدا.

### د- پەیوەندی ئابووری بە زانستی یاساوە:

ئــابووری بنــەمای کۆمەڵگــەی مرۆڤایەتییــەو یاســاش چوارچــێوەی ڕێکخستنەکەیەتی، بۆیە پێویستە ڕێسایەکی یاسایی پێشکەوتوو هـەبێت بـۆ ڕێکخستنی مامەڵە شارستانی و بازرگانی و ئابووریـەکان، لـەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییـە گـشتییەکان و بـۆ ئـەوەی هاوشـان بێـت لەگـەڵ پێـشکەوتنە ئابوورییەکان. پەرەسەندنی ئابووری پێویستە لە چوارچێوەی یاسادا هـەموار بکرێـت و هــەروەها یاســا کــار دەکاتــە ســەر چــالاکی ئــابووری، هەرچــەند دەقەکانی یاسایی نـەرمی بنـوێنن ئـەوا دەبنـە یارمەتیـدەر بـۆ پڕکردنـەوەی پێویــستییەکانی پەرەســەندنی ئــابووری، هــەر لــەم ڕوانگەیــەوە پێویــستە داڕێژەرانی یاسا شارەزاییان لە بارودۆخی ئابووری گشتی و پێویـستییەکانی کۆمەڵگەدا هەبێت.

### هـ- پەیوەندی ئابووری بە زانستی ماتماتیك (بیرکاری)یەوە:

بیرکاری لە ئـابووری هاوچـەرخدا گرنگـی و بایـەخی زۆری پـێ درا. بـە تایبەتی دوای ئەوەی ئابووریزان (جون ماینارد کینز John Mynerd Keynes) توانی پێشکەوتن لەبەکارهێنانی بیرکاری لـە ئـابووری بـەدی بـێنێ کـە بـووە هۆی هێنانە ناوەوەی شێوازی پێشکەوتوو لە زانـستی ئـابووری هاوچـەرخدا. ئەم گرنگیە زۆرەی بیرکاری بە ئابووری لەگـەڵ قوتابخانـەی بیرکـاری سـەری هەڵداوە کە بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە مەڕ کەرتەکانی ئابووری ناسراو بە (بــەکارهێنراوی بەرهــەمهێن In put - Out put models) و هــەروەها سەرهەڵدانی ئابووری بیرکـاری بـۆ خـستنەڕووی پەیوەندییـەکان لـە شـێوەی گۆڕاوەکـان ( Variables) و هاوکێـشەکان (Equations ) کـەوا ئـەم گۆڕاوانـە داڕشــتنی شــێوازێکی (الــصیغ Formula ) بیرکــاری ڕاســت و دروســتدا دەبەستێتەوە.

### و- پەیوەندی ئابووری بە زانستی ئامارەوە (الاحصاء):

ئامــار گوزارشــتکردنێکی ژمارەییــە بــۆ زانیارییــەکان و داتاکــان، و پلانـدانانی ئـابووری بـە پلـەی یەکـەم پـشت دەبەسـتێت بـە زانیاریـە داتـا و ئاماریەکان. و خشتەکانی ئامار بابەتێکی سەرەکین لـە پرۆسـەی پلانـدانان و شیکردنەوەی (شرۆڤەکردنAnalyses) ئابووری، بە تایبـەتی پێوانـەکردن بـە رادەیـەکی زۆر پـشت بـە ئامـار دەبەسـتێت، لێـرەدا بـەدیار دەکـەوێ کـە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان ئامار و ئابووریدا هەیە.

### ز- پەیوەندی ئابووری بە زانستی ژمێرییارییەوە:

زانستی ژمێریاری لە چەمکە پێویستەکانی دروستکردنی زانیاریـەکانی دارایی تایبەت بە پرۆژە دەکۆڵێتەوە. دروستکردنی زانیاریـەکان بریتییـە لـە کــرداری پێوانـــەکردن وتۆمـــار و شـــیکردنەوە و کورتکردنـــەوە و دواتـــر خستنەڕووی ئەم ئاکامانە (النتائج) بۆ ئەوکەسانەی لایان گرنگە و سوود لـەم زانیاریانـە وەردەگـرن، کـە ئـەوانیش خـاوەن پـرۆژە وبەڕێوەبەرایەتیـەکان وبەڵێندەرەکان ودەوڵەتن.

### ح-پەیوەندی ئابووری بە زانستی بەڕێوەبردن:

بەڕێوەبردن بە هەموو لقەکانیـەوە پەیوەنـدیان بـە ئابووریـەوە هەیـە، چونکە زانستی بەڕێوەبردنی بەرهەمهێنان بایەخ بە پڕاکتیزەکردنی بنەماکانی زانـستیانەی بـەڕێوەبردن دەدات لـە کارەکـانی بەرهەمهێنانـدا و هــەروەها زانـستی بـەڕێوەبردنی فرۆشـتنەکان بایـەخ بـە پراکتیزەکردنـی بنـەماکانی زانستیانەی بەڕێوەبردن دەدات لە کردارەکانی فرۆشتن دا. هەروەها زانـستی بازاڕکردن (التسویق Marketing) بنـەماکانی زانـستی بـەڕێوەبردن لـە بـواری

کارەکانی بۆبازاڕبردن پراکتیزە دەکات. زانستی بۆ بازاڕبردن لـە چـەند لقێـك پێـك دێـت لەوانـە بـەڕێوەبردنی فرۆشـتنەکان ( المبیعـات Sells) و ڕێکـلام (الاعلان Advertising ) و بازرگانی تاك و کۆ کە بە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەستراونەتەوە بەزانستی ئابووری. لەگەڵ بـەرپابوونی شـۆڕشی پیشەسـازی و پێشـکەوتنی کۆمەڵـگاکان لـە ڕووی ئابووریـەوە پێویسـتی بەم زانستە دەردەکەوێت.

## ط- پەیوەندی ئابووری بە زانستی ڕەوشتەوە(ئاکار)(الاخلاق):

ناکرێ زانستی ئابووری دوورەپەرێز بێت لە ئاکـار و زانـستی ڕەوشـت. ڕەوشتەکانی پیشەیی لە هەموو کەرتەکانـدا حـوکمی چـالاکییە ئابوورییـەکان دەکات، لێرەدا بەدەسکەوتی ڕەوا و ناڕەوا هەیە لـە لایـەنی ڕەوشـتیدا، هـەر چەندە زانستی ئابووری لـە سیـستەمی ئـابووری سـەرمایەداریدا لـە رەوشـت جیاکراوەتـەوە و هـیچ ڕێگـا چـارەیەك نییـە لـە بـەردەم ئـەم سیـستمانە بـۆ زاڵبوون بە سـەر ئـەو گرفتـە ئابووریانـەی کـە ڕووبـەڕوویان دەبێتـەوە بـەبێ گەڕانـەوە بـۆ ڕیـشەی ڕەوشـتی و پتـەوکردنی لایـەنی ڕەوشـت لـە چـالاکی ئابووری دا.

## دووەم : بیری (هزری) ئابووری:

لە وەتەی ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەویەیە درکی بە دوو ڕاستی گرنگ کردووە کە ئەمانەن:

راستیی یەکەم: **پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤ زۆرن (فرەن).**

راستیی دووەم: **ئەو دەرامەت وسامانەی لە سروشتدا هەیە، گەر لەگەڵ ئەو پێداویستییە زۆرانەی کە مرۆڤ هەیەتی بەراورد بکرێ، ئەوا هەموو پێداویستییەکانی پڕناکرێتەوە.**

کاتێك ئەم دوو ڕاستیە بەیەکەوە گرێ بدرێن گرفتەکان و دیاردە ئابوورییەکان سەر هەڵدەدەن، ئادەمیزاد هەمیشە هەوڵیداوە لەو هێزانە تێبگات کە ئەو دیاردە ئابووریانە بەڕێوە دەبات و کاریگەری لەسەریان هەیە. هەروەها هەوڵیداوە پەیوەندی نێوان ئەم هێزانە و دیاردە ئابوورییەکانی کاردەکەنەسەری لەشێوەی یاسایەکی زانستی گشتیدا دابڕێژێت.

## مێژووی هزری ئابووری:

مەبەست لەمەلێکۆلینەوە لەبارەی ئەو پێشکەوتنەی بەسەر بیری (هزری) ئابووری دا هاتووە بە دۆزینەوەو دیاریکردنی ئەو یاسایانەی کە کار لە دیاردە ئابوورییەکان دەکەن، و هەروەها ئەو سیاسەتەش کە پێویستە پەیرەو بکرێ ئەو سیستەمە ئابووریەش کە کاری پێدەکرێ.

یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی زانستی ئابووری لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی ڕێگا جیاجیاکانە کە دەکرێ کۆمەڵگەیەك وەڵامی پرسیارەکانی (کام، و چۆن، و بۆ کوێ) بداتەوە. کۆمەڵگە جیاجیاکان و بە پێی (سیستەمە ئابووریە هەڵبژێراوەکان) ڕێکخراون زانستە ئابوورییەکان

لێکۆڵینەوە لەبارەی میکانزمە جیاجیاکان دەکات کە دەکرێ کۆمەڵگایەك بەکاریان بهێنێت بۆ دابەشکردنی دەرامەتە سنووردارەکانی.

بۆ ئەم مەبەستەش سێ ڕێگای سەرەکی هەیە بۆ بەرهەمهێنان:

**ڕێگای یەکەم: ڕێگای بەرهەمهێنانی سەرمایەداری.**

**ڕێگای دووەم: ڕێگای بەرهەمهێنانی سۆشیالزمی.**

**ڕێگای سێیەم: ڕێگای بەرهەمهێنانی تێکەڵاو.**

ئەم ڕێگایانەش لەسەر چەند پێوەرێکی جیاواز دامەزراون کە ئەوانیش:

**١- خاوەنداریەتی بنەماکانی بەرهەمهێنەرەکان.**

**٢- ڕۆڵی هێزەکانی کۆمەڵایەتی و دارایی لە بەرهەمهێنان.**

**٣- لە ڕووی دابەشکردنی کۆمەڵایەتی بەرهەمەوە.**

لەم دواییەدا شێوازی دیکەی جۆراوجۆر لەرێگەی بەرهەمهێنان لەچوارچێوەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و بەیەکترەوە بەستنی لەسەر ئاستی وڵاتان سەری هەڵدا:

– گرنگەکانیان پرۆژەی نێودەوڵەتی و یان فرە رەگەزەکانن. کەوا ڕێگای بەرهەمهێنانی سەرمایەداری (پرۆژە فرە رەگەزەکان) سەرکەوتووبوون لە دەست بەسەراگرتنی جیهانی لە میانەی جوولەی سەرمایە دەرەکیەکان بە شێوەیەك بووە بە سیستەمی ئابووری پێنجەم کە ئەمەش جۆرێکی نوێ لە دابەش بوونی کاری نێو دەوڵەتی دەنوێنێ.

ئەو پێنج سیستەمە ئابووریانە کە دەتوانرێ لەبواری ئابووری هاوچەرخدا پەیرەو بکرێ ئەمانەن:

## ١- سیستەمی ئابووری سەرمایەداری:

Capitalism Economic System

ئـــــەم سیـــــستەمە کۆمـــــەڵێك تایبەتمەنــــدی (خەســــڵەتی Characteristics) تایبەتی خۆی هەیە لەمانەش:

أ – ئامانج ( قازانج):(Profit)The Target or Goal

مەبەسـتی سـەرەکی سیـستەمی سـەرمایەداری لـە بـیری تاکەکەسـدا هەڵقوڵاوەو بەندە بە لایەنی دەروونی خوودی تاکـەوە، لـە رووی ئـارەزووەوە هەوڵدەدات بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئەوپـەڕی قـازانج و تێربـوون بەشـێوەیەکی دیکـە بەدەسـتهێنانی نەخیتینـەیی، چـونکە مامەڵـەکردن لـە چوارچـێوەی ئـاڵوگۆڕی نەختینەیـە، ئـەوەش لـە سـایەی **کێبڕکـێ** و لایـەنگیری و رێنمـایی ئابووریـە لـەلای تـاکی ئـابووری –جـا لـە قۆنـاغی بەرهـەمهێنان بێـت یـان بەکاربردن.

ب – خاوەنداریەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهینان:

هێـزە بەرهـەم هێنـە ماددیـەکان تاکەکـەس خاوەنیـەتی (سـەرمایەی سەرمایەدارەکان و رێکخەرەکان، سامانە سروشتیەکان و کەرەستە خاوەکـان بـۆ خاوەنـەکانیان، زەوی بـۆ جووتیـاران و هێـزی کـار بـۆ کرێکـاران) هـەر یەکێکیان ئەوەی هەیەتی پێشکەش بە ئـەوەی تـری دەکـات بـۆ تـەواوکردنی کرداری بەرهەمهێنان بەرامبەر بە پاداشـتێکی دیـاریکراو: سـوود و قـازانج بـۆ سەرمایەدارانو رێکخەرەکان، بەهای سامانە سروشتیەکان و کەرەستەکان بۆ خاوەنـەکانیان، **کـرێ** بـۆ کرێکـار. واتـا بنـەمای یاسـایی بـۆ سیـستەمی سەرمایەداری خۆی لە مافی خاوەنداریەتی ( الملکیە ) لەلایـەك و پەیوەندیـە گرێبەستەکان (العقود ) لەلایەکی دیکەوە دەنوێنێ.

## ج– کرداری بەرهەمهێنان و دابەشکردن (التوزیع):

لە سیستەمی سەرمایەداری بەڕێگایەکی سروشتی لەمیانەی میکانیزمی نرخ و لەڕێگای هێزی بازاڕدا ئەنجام دەدرێت، لەم سیستەمەدا (میکانیزی نرخ) دەبێتە هۆی بەیەکەوە بەستنی (ئارەزووی بەکاربەران) و (ئارەزووی بەرهەمهێن و وەبەرهێنەکان)، چونکە کاتێك بەکاربەران داوای شمەکێك دەکەن واتا بەکاربردنی ئەو شمەکە زۆر دەبێت ئەوە نرخی ئەو شمەکە بەرزدەبێتەوە و بەرهەمهێنانی ئەو جۆرە شمەکە زۆر دەبێت، ئەمەش هانی (سەرمایەداران) و (رێکخەری) دیکە دەدات ئەو جۆرە شمەکە بەرهەم بهێنن، لە قۆناغی دووەمدا بەرهەمهێنانی ئەو شمەکە لەبازاڕدا زۆر دەبێت و نرخەکەی دادەبەزێت واتا خاڵی یەکتربڕینی خواست و خستنەڕوو دروست دەبێت، بەواتایەکی دیکە لەو خاڵەی خواست و خستنەڕوو یەکتری دەبڕن خاڵی هاوسەنگی ئەو شمەکەیە.

ئارەزووی بەکاربەران ←—— خواست دەنوێنێت.

ئارەزووی بەرهەمهێنەکان ←—— خستنەڕوو دەنوێنێت.



### د- ئابووری بازاڕ : Market Economy

کــرداری بەرهــەمهێنان و دابەشــکردن ( التوزيــع ) لــە سیــستەمی سەرمایەداریدا بە ڕێگایەکی سروشتی لە میانەی میکـانزمی نـرخ و لـە ڕێگـای هێزی بازاڕدا ئەنجام دەدرێت. هەردوو بیرۆکەکان تەواوکەری یەکترن، چونکە نـرخ ڕۆڵێکـی ســەرەکی دەبینێـت لــە کـرداری دابینکـردن و دابەشــکردنی دەرامەتە (مرۆییـەکان و ماددیـەکان ) لـە نێـوان بـەکارهێنراوە جیاجیاکانـدا، بەڵام ئەم نرخـە پێکهـاتووەو هەڵدەسـتێ بـە ئەرکـەکانی لـە میانـەی بـازاڕدا بووە.

### ٢- سیستەمی ئابووری سۆسیالیستی (ئاراستەکراو یان پلان بۆ دانراو):
### Socialist Economic System ( Planned or Directed)

لە ژێر سایەی ئەم سیستەمەدا سەرجەم بڕیارەکان کـە پەیوەسـتن بـە بەرهــەمهێنان و دابەشـکردنەوە لەلایـەن میرییــەوە دەدرێـن، و لـە ئـابووری ئاراسـتەکراودا میریـی خـاوەنی زۆربـەی بنــەماکانی بەرهەمهینانـە ( زەوی و سەرمایە) و هەروەها خاوەن و ئاراستەکاری زۆرینەی دامەزراوەکانە و کار بۆ کرێکـاران دابـین دەکـات و پێیـان دەڵێـت چـۆن کارەکانیـان ئـەنجام بـدەن، هەروەها بڕیار لەسەر چـۆنیەتی دابەشـکردنی بەرهەمـەکانی کۆمەڵگـە دەدات لەسەر هەموو شمەك و خزمەتگوزاریەکان. بە کورتی لە ئابووری ئاراستکراودا میریــی وەڵامــی زۆربــەی پرســیارە ســەرەکیەکانی ئــابووری لەمیانــەی خاوەنداریــەتی بۆدەرامەتــەکان و بــەهۆی توانــای لەســەر چەســپاندنی بڕیارەکانی دەداتەوە.

## ٣- سیستەمی ئابووری تێکەڵاو: Mixed Economic System

سیستەمێکی مام ناوەندییەو هەموو خەسڵەتە چاك و پۆزەتیڤەکانی سیستەمی سەرمایەداری و سۆشیالیستی لەخۆوە دەگرێت و هەوڵ دەدات لەکەم و کورتیەکانیان بەدوور بێت، دەوڵەتان جیاوازن لە پەیڕەوکردنی ئەم سیستەمەو لە رادەی کۆکردنەوەی خەسڵەتەکانی هەردوو سیستەمەکە، هەندێك لە سیستەمە تێکەڵاوەکان بایەخێکی زۆریان داوە بە خەسڵەتەکانی سیستەمی سەرمایەداری، هەندێکیشیان بایەخێکی زۆریان داوە بە خەسڵەتەکانی سۆسیالیزمی.

بەم شێوەیە هەندێ سیستەمی ئابووری تێکەڵاو پەیدا بووە بەسیما و ئاراستە سەرمایەداریە و یاخود سیمای سیستەمی ئابووری سۆسیالیستی لەخۆوە گرتووە.

### چالاکییەکانی ئابووری دەوڵەت لە سیستەمی ئابووری تێکەڵاو ئەم ئەرکانەی خوارەوەیان هەیە:

١- دابینکردنی بنەما یاساییەکان بۆ کارکردنی دەزگای نرخ.

٢- پارێزگاریکردن لە کێبڕکێ (المنافسة).

٣- تەواوکردن و رێکخستنی کاری دەزگای نرخ.

٤- نەهێشتنی ئەو بێکاری و هەڵاوسانەی کەلە ئاکامی بارگۆڕانی ئابوورییەوە (الدورات الاقتصادیة) سەرهەڵدەدەن.

## خەسڵەتەکانی ئابووری تێکەڵاو:

١- بوونی کەرتی گشتی (**القطاع العام**) شان بە شانی کەرتی تایبەت (**القطاع الخاص**).

٢- بوونی پلاندانان یان ئاراستەکردن لەلایەن میرییەوە.

٣- ڕۆڵی دەوڵەت لە چاودێریکردنی کەرتی تایبەت.

٤- دڵنیایی (**التامین**) دەوڵەت لە بەرژەوەندی کار و کرێکاران دژ بە بێکاری.

٥- دانانی سنوورێك بۆ قۆرخکاری (**الاحتكارات**).

## سێیەم: چالاكییە ئابوورییەكان: Economic Activities

### ١- بەرهەمهێنان: Production

بریتییە لە كرداری گۆڕینی بەردەوامی هێزە سروشتیە ماددیەكان كە ناتوانن راستەوخۆ پێویستییەكانی مرۆڤ پڕبكەنەوە، كە مرۆڤ دەیگۆڕیت بۆ شمەك و خزمەتگوزاری كەوا شیاون بۆ پڕكردنەوەی پێویستە مرۆییەكان. كەواتە بەرهەمهێنان كردارێكە سوود دەرەخسێنێ یان زیادی دەكات.

### ٢- دابەشكردن: Distribution

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ئەو تاكانەی كە لە كۆمەڵگەدا لەگەڵیان دەژی و كە بەشداری یەكتر دەكەن لە كرداری بەرهەمهێنان و ئەو دەرەنجامانەش كە بەهۆی بەشداری كردنەكەوە پەیدا دەبێت لە بەدیهێنانی پسپۆری و كار دابەشكردن، دابەشكردنی بەرهەمە كۆمەڵایەتییەكان بەسەر ئەو كەسانەی كە بەشدارییان كردووە لە چالاكی ئابووریداو بەسەر ئەو كەسانەش بەشدار نەبوون.

### ٣- ئاڵوگۆڕكردن: Exchange

واتا گواستنەوەی كارگێری بۆ خاوەنداریەتی شمەك و خزمەتگوزاری كە لە چالاكی ئابووری بەدەستهێنراون، هەروەك بازرگانی ناوخۆ بازرگانی دەرەكی نموونەن بۆ ئەم جۆرە ئاڵوگۆڕكردنە.

### ٤- بەكاربردن: Consuming

كرداری ئامادەكردنی دەرامەتەكانە بۆ بەكاربردنی تاك و كۆمەڵ و تێركردنی پێویستە مرۆییەكان و پاڵنەر هۆكارە رەفتاری و كۆمەڵایەتییەكان كە بوونەتە هۆی زیادبوونی خەرجییەكانی بەكاربردن.

# بنەماکانی بەرهەمهێنان
# FACTORS OF PRODUCTION

ئەو ئامرازانەن کە بەهۆیەوە پرۆژەکان ئەرکەکانیان رادەپەڕێنن. بە واتایەکی دیکە (هەموو ئەو شتانەن کە بەشدار دەبن لە کرداری بەرهەمهێنان). بنەماکانی بەرهەمهێنان ئەمانەن:

## ١–زەوی ( دەرامەتە سروشتیەکان ): ( *Land* ) Natural Resources

بریتییە لە سەرجەم ئەو دەرامەت و کەرەستانەی لە سروشتدا هەن، هەروەها هەموو شتەکانی سەر زەوی و ئەو دەرامەتە مادیانەش دەگرێتەوە کە لەسەریەتی، هەروەها ئەوەش دەگرێتەوە کە چواردەوری زەوی داوە (**محیط الارض**) زەوی بنەمایەکی گرنگە، چونکە بنەمایەکی سەرەکیە بۆ بەرهەمهێنان و لە سەریدا کردارەکانی بەرهەمهێنان ئەنجام دەدرێن.

## ٢- کار ( دەرامەتە مرۆییەکان ): ( *Labour* ) Human Resources

**کــار**: چالاکییەکی هوشیارانەی مرۆڤە بە مەبەستی ئەوە ئەنجام دەدرێت کە سوودێك بگەیەنێت یان سوودێك زیاد بکات.

**یان بریتییە** لە چالاکیەکی قورسی و ناچاری (ملزم) مرۆڤ و بەسەرچاوەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگە دادەنرێ.

**بۆ ئەوەی کارکردن واتایەکی ئابووری هەبێت پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێت:**

أ- ئەم هەوڵەی ئەنجام دەدرێت لە لایەن مرۆڤەوە بێت.
ب- بەزۆر نەبێت، بەڵکو بە ئارەزوو بێت ( الرغبە Desire ).وەکو سوغرە پێکردن.
ج- کەسێکی هۆشمەند کارەکە ئەنجام بدات، بۆ رابواردن و کات بەسەر بردن نەبێت.
و- ببێتە مایەیی دروست بوون یان زیاد بوونی کەڵك (سوود).

## ٣- سەرمایە : Capital

ئامرازێکی بەرهەمهێنانە کە بەمەبەستی بەکاربردنی ڕاستە وخۆ بە کارنایەت، بەڵکو بەشداری دەکات لە بەرهەمهێنانی شمەکی دیکە. دەتوانین سەرمایە دابەش بکەین بۆ دوو جۆر:

أ – سەرمایەی نەختینەیی و سەرمایەی راستەقینە
Monetary and Real Capital
ب – سەرمایەی بەرهەمهێن و سەرمایەی دەسهات.

## ٤- ڕێکخستن : Organization Enterpreneur

جۆرێکی تایبەتە لە چالاکی مرۆڤ هەندێ جار لە ژێر ناوی کار دادەنرێت، بەڵام جۆرێك لە تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئاماژەش بە گرنگی کۆکردنەوەی بنەماکانی دیکەی بەرهەمهێنان دەکات کە (زەوی، کار، سەرمایە) و بەکارهێنانیان لە کرداری بەرهەمهێناندا، و بڕیاردان بۆ ئەنجامدانی ئەم کردارەو لە ئەستۆگرتنی مەترسیەکانی جێبەجێکردنی. ڕێکخەر ئەو کەسە نییە کە تەنها ئەرکی بەڕێوەبردنی پرۆژەکەی پێ ڕادەسپێردرێت، بەڵکو پێشڕەوە ئەو کەسەیە کە هەموو بەهرە و تواناکانی لە خزمەتی پرۆژەکە دادەنێت بۆ گەشەپێدانی، ئەویش لە ڕێگای بەرهەمهێنانی شمەکی نوێ یان بەکارهێنانی ڕێگای تەکنەلۆژی نوێ لە بەرهەمهێناندا.

## چوارەم: پێویستییەکان Wants Needs

پێداویستی: ئارەزووییەکە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامرازانـەی کـە پێویـستن بـۆ مانەوەی مرۆڤ یان بۆ پاراستنی بە بێ ئەوەی پەیوەست بـێ بەدەسـتکەوتنی ئەم هۆیانە، بەڵام زانیارییـەکانی مـرۆڤ وا دەکـات ئـەو مەبەسـتانە بزانـێ کـە هەوڵی بـەدیهێنانی دەدات و ئـەو رێگـەو شـێوازانەش بزانـی رێگـە دەدات بـە دەستکەوتنی ئەم مەبەستە.

پێداویستی هەر جۆرێك بێت سێ بنەمای هەیە، کە ئەمانەن:

١. هەستکردن بە ئازار (وەك برسیەتی، و تێنیبوون بۆ نموونە).

٢. زانینی ئامرازێك بۆ نەهێشتن یان سارێژکردنی ئەو ئازارە.

٣. ئارەزوو بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بە مەبەستی نەهێشتنی هەسـتکردن بەو ئازارە.

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

**پ ١ : ئەم زاراوانەی خوارەوە پێناسە بکە :**

زانستی ئابووری – مێژووی هزری ئابووری – کار – سەرمایە– ڕێکخستن– پێویستییەکان – ئاڵوگۆڕکردن.

**پ٢: وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە:**

١. ئایا ئابووری زانستە یان هونەر؟

٢. پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و زانستەکانی تر(هەر زانستێك بەتەنها یان هەموو زانستەکان).

٣. ئەو لایەنانە چین کە هزری ئابووریان لەسەر دامەزراوە؟

٤. باس لە ڕێگە سەرەکیەکانی بەرهەمهێنان بکە.

٥. ئەو هۆکارانە چین کە وایکرد وڵاتان دابەش بکرێن بۆ وڵاتانی پێشکەوتوو لە ئابووری و وڵاتانی گەشەکردوو.

٦. تایبەتمەندییەکانی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری باس بکە.

٧. باسی سیستەمی ئابووری سۆسیالیستی بکە.

٨. باسی سیستەمی ئابووری تێکەڵاو بکە.

٩. ئەرکی چالاکییەکانی ئابووری لە سایەی سیستەمی ئابووری تێکەڵاو دیار بکە.

١٠. تایبەتمەندییەکانی سیستەمی ئابووری تێکەڵاو بکە.

١١. چالاکییەکانی ئابووری چین ؟ بیانژمێرەو باسیان بکە.

١٢. بنەماکانی بەرهەمهێنان دیاری بکەو شرۆڤەیان بکە.

١٣. ئەو بنەمایانە چین کە مانایەکی ئابووری بە کار دەبەخشن؟

١٤. سەرمایە دابەش دەکرێت بۆ چەند جۆرێك، باسیان بکە.

١٥. باس لە ڕێکخستن بکە وەك هۆکارێکی بەرهەمهێنان.

١٦. بنەماکانی پێویستی مرۆڤ چین؟

# سەرچاوەکانی بەشی یەکەم


١. بول أ. ساموبلسون و ويليام د. نوردهاوس، الاقتصاد، الطبعة الخامسة عشرة، ترجمة : هشام عبدالله، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠١.

٢. د. حسين عمر، مقدمة في علم الاقتصاد : نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣. د. عبدالكريم كامل عبدالكاظم، النظم الاقتصادية المقارنة، جامعة الموصل، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٨.

٤. د.مصطفى رشدي شيحة، علم الاقتصاد من خلال التحليل الجزئي، الدار الجامعية،الاسكندرية، ١٩٨٦.

٥. د. كريم مهدي الحسناوي، مبادئ علم الاقتصاد، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩.

٦. لبيب شقير، تاريخ الفكر الاقتصادي، مطبعة نهضة مصر، القاهرة، ١٩٧٨.

٧. د. محسن كاظم، تاريخ الفكر الاقتصادي: ابتداءً بنشاته وانتهاءً بالماركسية، الطبعة الاولى، ذات السلاسل، الكويت، ١٩٨٩.

٨. د. عبدالقادر محمد عبدالقادر عطية، التحليل الاقتصادي الجزئي بين النظرية و التطبيق، الدار الجامعية،الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٩. د. محمد علي الليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتصاد : الاقتصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

١٠. د. علي يوسف خليفة و د. احمد زبير جعاطة، النظرية الاقتصادية : التحليل الاقتصادي الجزئي، دون، ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

١١. د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣.

١٢. د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هاشم و د. محمد عبدالعزيز عجمية،مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

١٣. د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٣.

١٤. د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٥. سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة : خضر نصار، مركز الكتب الاردني،عمان، ١٩٨٨.

١٦. يوسف كمال محمد، فقه اقتصاد السوق : النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النشر للجامعات، القاهرة، ١٩٩٨.

17. Michael A. Leeds، Peter Von Allen & Richard C. Schiming، " Econo - mics "، Pearson Education Inc.، Boston، 2006.
18. Jeffrey M. Perloff، " Microeconomics "، Fourth Edition، Pearson Int'l Edition، Boston، 2007.
19. Robert J. Gordon، "Macroeconomics "، 10th Edition، Pearson Inc.، New York،2006.
20. Stanley L. Brue & Campbell R. McConell، " Essentials of Economics "، McGraw – Hill Inc.، Boston، 2007.
21. Damodar N. Gujarati، " Essentials of Economics "، Third Edition، McGraw – Hill Inc.، Boston،2006.
22. Stephen L. Slavin، " Economics "، 8th Edition، McGraw – Hill، New York، 2008.
23. Bradley R. Schiller، " The Microeconomics Today "، 10th Edition، McGraw – Hill، Boston، 2006.
24. Bradley R. Schiller، " The Macroeconomics Today "، 10th Edition، McGraw – Hill، Boston، 2006.
25. David D. Friedman، " Price Theory "، 2nd Edition، South – Western Publishing Co.، Cincinnati،1990.

# بەشی دووەم
# بەهــاو نــرخ
# VALUE AND THE PRICE

## بەهای بەکارهێنان و بەهای ئاڵوگۆڕکردن :
## Value in use and Value in exchange

هەموو شمەکێك ئابووری بێت (واتە مرۆڤ ڕۆلی هەبێت لە بەرهەمهێنانی) یا سەربەخۆ بێت (واتە لە سروشتدا هەبێت) بەهایەکی بەکارهێنانی ( Value in use ) هەیە، و مەبەست لە بەهای بەکارهێنان: (توانای شمەکێك کە پێداویستییە راستەوخۆکانی مرۆڤ پڕ بکاتەوە، بە واتایەکی تر بەهای بەکارهێنان ئەو کەڵکەیە کە دەرئەنجامی بەکارهێنانی شمەکێکە). و لە بەر ئەوەی کە بەهای بەکارهێنان هەر تەنیا شمەکی ئابووری ناگرێتەوە، بەڵکو شمەکی نائابووریش دەگرێتەوە، ئەو بەهایە پێویستی بە بازاڕ یاخود ئاڵوگۆری بازاڕ نییە لە لایەن تاکەکان.

مەبەست لە بەهای ئاڵوگۆڕکردن ( القيمة التبادلية Value in exchange) (توانای شمەکێکە کە ئاڵوگۆڕ بکرێت لەگەڵ شمەکێکی تر کە تایبەتمەندی خۆی هەیە و جیاوازە لە تایبەتمەندییەکانی شمەکی یەکەم). لێرەدا بەهای ئاڵوگۆڕکردن خۆی لە پەیوەندێکی ڕێژەیی (**العلاقة الكمية**) دەنوێنێ بە واتا ئەو ڕێژەیەی کە شمەکێك بە شمەکێکی تر ئاڵوگۆڕ دەکرێت.

بەهای ئاڵوگۆڕکردن بە پێچەوانەی بەهای بەکارهێنان تەنها پەیوەندی بە شمەکی ئابوورییەوە هەیە، و بریتییە لە بەهایەکی کۆمەڵایەتی، چونکە بەهای ئاڵوگۆڕکردن بوونی نییە بەبێ بوونی تاکەکان کە شمەکی ئابووری بەرهەم دێنن و لە بازاڕ دەیخەنە ڕوو بەمەبەستی ئاڵوگۆڕکردنیان.

## بەهای ئاڵوگۆڕکردن و نرخ :
## Value in Exchange & Price

چەمکی بەهای ئاڵوگۆڕکردن بەستراوەتەوە بە بەراوردکردن یان بە پەیوەندی لە نێوان بڕی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان دوو شتی جیاواز، بۆ نموونە دەکرێ باس لە بەهای ئاڵوگۆڕکردنی شمەکێك "بۆ نموونە زێڕ" ڕێژەیەکی ئاڵوگۆڕکردنی بە شمەکێکی تردا "بۆ نموونە کەلوپەل"دیاربکرێ و لەبەر ئەوەی ئاڵوگۆڕکردن لە کۆمەڵگاکانی هاوچەرخدا لە ڕێگای " دراوەوە "دەکرێ دوای وازهێنان لە شێوازی سەوداکردن (**المقايضة** Barter) بۆیە دەکرێ نرخی کەلوپەلەکان بە دراو دابنرێ — و نرخی زێڕ بە دراو دەست نیشان بکرێ، بەم شێوەیە نرخ بریتییە لە گوزارشتی نەختینەیی (**التعبير النقدي**) بۆ بەهای شمەکێکی ئابووری.

کاتێك دەڵێت ئاو " بەهای "خۆی هەیە مەبەست لەوە پێداویستییەکی دیاریکراوی مرۆڤ پڕ دەکاتەوە بە بەکارهێنانی ئەم شمەکە دێتە دەست — لەم سۆنگەیەوە بیرکردنەوە لە " سوود " ئەوا بەهای بەکارهێنانی ئەم شمەکە دەگرێتەوە بە بێ ڕەچاو کردنی بەرزی ونزمی نرخەکەی لە بازاڕدا — بەڵام باسکردنی بەهای خانوویەکی دیارکراو، ئاماژە بەم بەهایە مەرج نییە بە نرخی فرۆشتنی ئەم شمەك دابنرێ یان بەهای ئاڵوگۆڕکردنی بێت، بەواتایەکی تر ئەم نرخەیە کە کڕیارێك دەیەوێ بیدات بەرامبەر بەدەست هێنانی خانووەکە — یان ئەم نرخەی کەوا پێویستە بیدات ئەگەر ئارەزووی بەدەست هێنانی هەبێت گەر بیەوێت تێیدا نیشتەجێ بێت.

## پەرەسەندنی بیردۆزەی بەها :

The progress of Value Theory

شیکردنەوەی کێشەی بەها بەچەند قۆناغێك تێپەڕبووە تاکو گەیشتۆتە ئـــەوەی ئێـــستا هەیـــە، دەتـــوانین بـــەگوێرەی ئـــەو بیردۆزانـــەی خـــوارەوە لێکۆڵینەوە لەبارەی پەرەسەندنی شیکردنەوەی بەها بکەین:

## یەکەم - بیردۆزی بەهای کار و خەرجی بەرهەم:

نووسەرە کلاسیکیەکان جیاوازیان لە نێوان بەهای بەکارهێنان و بەهای ئـالۆگۆڕکردن کـردووە. **بـەهای بـەکارهێنان** ئـەم کەڵکەیـە کـە کەسـێك لەبەکارهێنانی شمـەکێك دەسـتی دەکـەوێ. بـەڵام **بـەهای ئـاڵوگۆڕکردن** ئـەو ڕێژەیەیە کەوا لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕکردنی شمەکێك بە شمەکێکی تر لە بـازاردا بەدەسـت دەهێنرێـت. بـەهای ئـاڵوگۆڕکردن بـۆ هـەر شمـەکێك بـە بۆچـوونی کلاسـیك لەسـەر بنـەمای ئـەو کارەیـە کـە دەیکـات. یـاخود لەسـەر بنـەمای ژمـارەی کاتـژمێرەکانی کارکردنـە کـە کـاری تێـدا کـراوە بـۆ بەرهـەمهێنانی شمەکەکە.

## ئەو رەخنانەی کە ئاراستەی بیردۆزەی بەهای کار کراون:

١- فەرامۆشکردنی کاریگەری خواست بۆ بەهای شمەکەکان. چونکە بڕێکی زۆر لە کار بۆ بەرهەمهێنانی شمەکێکی دیاریکراو خەرج دەکرێت، بەڵام کە ئەم شمەکە دەخرێتە بازاڕ خواستی لە سەر نابێت، دواتریش بەهای ئاڵوگۆڕکردنی نابێت.

٢- ڕەچاوی بنەماکانی دیکە ناکات کە بەشداری لە بەرهەمهێنان دا کەدا دەکەن. هەرچەندە دیڤید ڕیکاردۆ دانی بە گرنگی سەرمایە داناوە لە کرداری بەرهەمهێنان، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، چونکە بە کارێکی پاشەکەوتکراوی لە قەڵەم دەدات. بەڵام ئەم بۆچوونەی کەوا سەرمایە هەمیشە لەگەڵ کاردا بە ڕێژەیەکی جێگیر بەشداری دەکات لە کرداری بە بەرهەمهێناندا بۆچوونێکە لە ڕاستییەوە دوورە.

٣- بیردۆزەیەکە ناتوانێ دیاردەی بەها لێك بداتەوە. و بەهای فرۆشتنی هەر شتێك لە بازاڕدا تەنها بە بڕی تێچوونی بەرهەمهێنانەکەی دیاری ناکرێت، ئەم بیردۆزە بارودۆخی خواستی لەسەر شمەکەکە لە بازاڕدا پشتگوێ دەخات.

٤- هەروەها ناتوانێت بەهای شمەکە دەگمەنەکان لێك بداتەوە واتا ئەم شمەکانەی ناتوانرێ جارێکی دیکە بەرهەم بهێندرێت بۆ نموونە تابلۆ هونەرییەکان.

## دووەم: بیردۆزی سوودی سنوورەکی: Marginal Utility Theory

کاتێك کەسێك بیر لە نرخی شمەکێك دەکاتەوە کەوا بەنیازە بیکڕێت ئەوا ڕاستەوخۆ بیر لەو سوودەش دەکاتەوە کە لەو شمەکە دەستی دەکەوێت. بە دەگمەن بیر لە بەهای شمەکەکەو تێچوونی بەرهەمهێنانەکەی دەکاتەوە. دەکرێ بڵێین کڕیار هەمیشە هەوڵ دەدات بەهای شمەکەکەو کەڵکەکەی بەیەکترەوە ببەستێتەوە، لێرەدا پێویستە ئەم پرسیارە بوروژێنین کە لە بەرچی ئابووریناسانی کلاسیك (کۆن) بەهای شمەکەکان بە کەڵکەکەی نابەستنەوە؟

ئابووریناسە کلاسیکییەکان وەکو: "ئادەم **سمیث**، و دیڤید ڕیکاردۆ، و ئەوانی تر" ئەم بەیەکتر نەبەستنەوەی نێوان بەهای ئاڵوگۆڕی شتەکان و سوودەکەی بۆ دوو هۆکار دەگەڕیننەوە:

١-هۆکاری سەرەکی یەکەم ئەوەیەکە کلاسیکییەکان بەرەو ڕووی ئەوە دەکاتەوە کە لە مێژوویی بیردۆزی بەهاکان بە (نهێنی بەها) ناسراوە ئەوانە تێبینی ئەوەیان کرد کە هەندێك شمەك هەیە کەڵکی زۆر گەورە دەبەخشن وەك (هەوا) کەچی بەهایەکی بازاڕی نییە، هەوا لە شێوە سروشتیەکەیدا شمەکێکی سەربەخۆیەو هەموو بونەوەرێك دەتوانێ پێداویستی خۆی لێ دابین بکات بەبێ هیچ بەرامبەرێك، ولەهەمانکاتدا تێبینی ئەوەیان کرد کە هەندێك شمەك هەیە کەڵکیان زۆرکەمترە لە کەڵکی هەوا کەچی سەرەڕای ئەوەش نرخەکانیان زۆر بەرزە. ئەم بیرکردنەوە سادەیە ئاماژە بە نەبوونی پەیوەندی نێوان بەهای هەواو کەڵکەکەی دەکات.

بەڵکو وا دەکات وا بزانرێ کەوا نرخی هەوا یەکسانە بە هیچ، چونکە کەسەکەهیچ شتێك نادات بۆ بەدەست هێنانی.

٢– هۆكاری دووەم خۆی لە خەرجیەكانی بەرهەم دەبینێتەوە بۆ گەڕان بەدوای لێكدانەوەی بەهای ئاڵوگۆڕكردن بۆ شمەكەكان و سەرقاڵبوونیان بە بابەتی شیكردنەوەی ئەو هۆكارانەی كە بەشی ڕێژەیی ئەم بنەمایانە دیاری دەكات كە لە بەرهەمهێنانەكە بەشداریان كردووە.

تا كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەم بیردۆزی خەرجی بەرهەمهێنانی بۆ بەهاكان بەردەوام هزری ئابووری سەرقاڵ كردبوو كاتێك بیردۆزی كەڵكی سنوورەكی لەسەردەستی ڕێبەرانی " قوتابخانەی شی كردنەوەی سنوورەكی " (**مدرسة التحليل الحدي**) وەك: (كارل مێنجر، وستانلی جیڤۆنز، ولیون ڤالراس) سەری هەڵدا. و ئەوكات گرنگی ئەم دۆزینەوە زانستییە لە پەرەسەندنی بیردۆزی بەها دەركەوت.

جێگەی ئاماژە پێدانە كەوا بنەما سەرەكییەكانی بیردۆزی – جیڤۆنز – و قوتابخانەی كلاسیكی لە پەرتووكی "جۆشن" دا باسی لێوەكراوە – بنەمای سەرەكی بیردۆزەكەی بۆ بەها لەم بڕگەیەدا پوخت كراوەتەوە (بەها بە تەواوی پشت بە سوود دەبەستی) بەهەمان ڕێڕەوی (جۆشن) (جیڤۆنز) ئەو كاریگەریانەی شی كردۆتەوە كە گۆڕانی بڕی شمەكەكان بەسەر كەڵكە وەرگیراوەكان دادێت لەسوودە یەك بەدوای یەكەكاندا. بە بنەمای كەمبوونەوەی كەڵكەكانی داناوە، و لە باسكردنی بۆ پێكهاتنی بەهای ئاڵوگۆڕكردن لە گەڵ یاسای دووەمی جۆشن كۆكە – گەیشتە ئەنجامێك كە حاڵەتی هاوسەنگی لە ئاڵوگۆڕكردنی دوو شمەك، "كاتی هاوسەنگی دەبێت كە كەڵكەكانی سنووردای لە نێوان دوو شمەكدا نرخەكانیان وەكو یەكتر بن".

بەواتایەکی تر هزرڤانانی قوتابخانەی سنووورداری ڕاو و بۆچوونیان وایە کەوا بەهای هەر شمەکێك سەبارەت بە کەسێك بەو کەڵکە دیاری دەکرێت کە لە دوایین یەکەی بەکاربراوەکە وەری دەگرێت بەم شێوەی خوارەوە ڕەخنەی لێ گیراوە:

یەکەکانی یەکەم لە شمەك کەڵکێکی زۆر دەدات بە بەراورد لە گەڵ کەڵکی دوایین یەکە، و چۆن بەهای هەموو یەکەکان لە سەر بنەمای کەڵکی دوایین یەکە دیاری دەکرێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئاماژە بە لایەنگرانی قوتابخانەی سنووورداری دەکرێت بە یاسایەکی تر وەری دەگرن کە ئەویش ( یاسای جێگرتنەوە) یە بە پێی ئەم یاسایە یەکەکانی هاوشێوە وجێگر لە شمەکدا کەوا هەمان خەسڵەتیان هەیە کە دەکرێ هەندێکیان شوێنی هەندێکیان بگرنەوە هەموویان هەمان بەهایان هەیە بەمجۆرە یەکە وێکچووەکان لە هەمان شمەك دا گشتیان لای یەکێك بوون هەمان بەهای دەبێت. چونکە هەر شمەکێکیان شوێنی یەکەکانی تر دەگرێتەوە و لەبەر ئەوەی کەڵکی دوایین یەکە هەڵوێستی کەسەکە دیاری دەکات بۆ گشت یەکەکانی شمەك،بۆیە هەر یەکەیەك لە یەکەکانی شمەك هەمان بەهای هەیە کەوا لە سەر بنەمای کەڵکی دوایین یەکە دیاری دەکرێت.

ئەو ڕەخنەیەی لەم بیردۆزە (بیردۆزی کەڵکی سنووردار) گیراوە، ئەوەیە کە لایەنی خستنەرووی لە شیکردنەوەی بەها فەرامۆش کردووە — بە پێچەوانەی بیردۆزی کار بۆ بەها.

بەڵام (ئەلفرێد مارشال) بە گونجاندنی نێوان کەڵکی سنووورداری و خەرجی سنووورداری لە شیکردنەوەی بۆ بەهادا وەرگرتووە یەکەمیان حوکمی خواست دەکات و دووەمیان حوکمی خستنەڕوو دەکات، بەڵام (هێکس) ڕەخنەکەی لە پێوانی کەڵکی سنووورداریەکە ئەوەیە کە ناتوانرێت لە جیاتی ئەوە بیرۆکەی تێکرایی جێگرتنەوەی سنووورداری بەکاربهێنرێ.

## چەمکی نرخ : Importance Of Price

دامەزراوە بەرهەمهێنەرەکان و کارگێڕییەکان بە تایبەتی دەزگا بەرهەمهێنەکان بەم شێوەیە پێناسەی نرخ دەکەن:

– دیاریکردنی بەهای شمەك یان خزمەتگوزارییە بە پارە.

– یان بریتییە لە بڕی ئەو دراوەی کەوا کڕیارێکی دیاری کراو دەیداتە فرۆشیارێك بە مەبەستی بەدەستهێنانی بڕێکی دیاریکراو لە شمەکێك یان خزمەتگوزاریەك.

نرخەکان بۆ دوو جۆر دابەش دەکرێن:

**نرخە ڕەهاکان:** بریتییە لە نرخی شمەکێك و پێوانەکردنی بە دراو.

**نرخە ڕێژەییەکان:** بریتییە لە بەهای شمەکێك بە پێوانەی بە شمەکێکی تر.

## گرنگی نرخ : Importance Of Price

گرنگیەکەی لەوەدا سەرهەڵدەدات کەوا ئامرازێکی کاریگەرە بۆ:

١. دابەشکردنی دەرامەتە ئابوورییەکان لە نێوان کەرتە جیاجیاکاندا، لە ڕێگای دابەشکردنی بەکارهێنراوەکانی کرداری بەرهەمهێناندا.

٢. دابەشکردنی شمەك و خزمەتگوزارییەکان بەسەر چین و توێژەکانی کۆمەڵگە.

٣. بەرزکردنەوەی توانای بەڕێوەبردنی دامەزراوەکان و هاندانیان بۆ پێشخستنی لایەنی (هونەری یان تەکنۆلۆژی).

٤. کاریگەری لەسەر شێواز و ئاڕاستەی بازرگانی نێودەوڵەتی و دابەشکردنی داهاتەکان لە نێوان وڵاتاندا هەیە.

## دیاریکردنی نرخ لای کۆمپانیاکان :

لەسەر ئاستی کۆمپانیا یان یەکەی ئابووریدا، کرداری نرخدانان ئەرکێکی گرانە کەوا ڕووبەڕووی بەڕێوەبردنی کۆمپانیەکان دەبێتەوە،چونکە بەستراوەتەوە بە چارەنووس و توانای مانەوەی لە بازار، تاوەکو بتوانێ شمەك وخزمەتگوزاری بە باشترین نرخ و بەکەمترین ئەرك و تێچوون پێشکەش بەکاربەران بکات و ڕەچاوی پابەندبوونیان کردوە لە بەرامبەر کۆمەڵگا کەوا بنەمای بوونیەتی. هەرچەندە کۆمپانیاکان بەدوای بەدەستهێنانی گەورەترین داهات لەگەڵ بەرزترین ڕێژەی قازانجدا دەگەڕێن، بۆیە بە ئەنقەست نرخەکان کەم دەکاتەوە بۆ دەستەبەربوونی بەشەکەی لە بازاڕدا و ڕووبەڕووبوونەوەی پێشبڕکێی کۆمپانیاکانی تر.

میکـانزمی دیـاریکردنی نرخـەکان لـە سیـستەمێکی ئـابووری بـۆ سیـستەمێکی تـر جیـاوازە، هـەروەها جیـاوازە لـە نێـوان بازارەکـانی یـەك سیستەمیشدا،ئەو هۆکارانـەی کـەوا نرخـی بـەرووبومی کـشتوکاڵی لـە بـازار دیـاری دەکـەن جیـاوازن لـە گـەڵ ئـەم هۆکارانـەی کـەوا نرخـی شمەکـە پیشەسازیەکان و خزمەتگوزارییەکان دیاری دەکەن.

لـە سیـستەمی سـەرمایەداریدا نرخـەکان بـە پـێ میکـانزمی بـازاڕ "هێزەکـانی خـستنەڕوو و خواسـت" دیـاری دەکـرێن، خاوەنـدارێتی تایبـەت (**الملكية الخاصة**) پێویستی بە بوونی شـێوازی بـەکاربردن و مـافی بـەکاربردنی ئەم شێوازانە هەیە وبەکاربەر ئازادە لـە چۆنییەتی بـەکارهێنانی داهاتەکـەی وئەو شێوازەی کە لەگەڵ خۆی گونجاوە،و گریمانەکانی تـر کـە لـە سـایەیاندا میکانزمی نرخەکان کاردەکەن بۆ حوکم کردنی ئەم میکانزمـە بـەپێی یاسـای خواسـت و خـستنەڕوو نرخـەکان بڕیـاردراون بەڕادەیـەکی گـەورە لـە ڕێگـای پەیوەنـدی لـە نێـوان بەرهـەمهێن و بەکاربـەر — واتـا گونجـان لـە نێـوان ئارەزووەکانی بەرهەمهێنەران و بەکاربـەرەکان — بۆیـە نرخـەکان پێـوەرێکی گرنگن و ڕێنیشاندەرن بۆ بەرهەمهێنەران بۆ بەدەسـتهێنانی زۆرتـرین قـازانج، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە نرخەکان بکەونە ژێـر کاریگـەری میکـانزمی بـازار و هێزەکانی خواست و خستنەڕوو بەبێ ڕێکخستن ودیاریکردن.

## ئەو هۆكارانەی كار دەكەنە سەر نرخەكان :

دەكرێ گرنگترین ئەو هۆكارانە دەست نیشان بكەین كە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ كاردەكەنە سەر دیاریكردنی نرخەكان بەم شێوەی خوارەوە:

### ١ – تێچوونەكان : Costs

تێچوونەكان بە یەكێك لە هۆكارە گرنگەكان دادەنرێ بۆ دیاریكردنی ئاستی نرخەكان كەلەكاتی دەست نیشان كردنی نرخەكان پێویستە ڕەچاوبكرێت. تێچوونەكان هەموو ئەو خەرجیانە دەگرێتەوە كە پێویستن بۆ بنەماكانی بەرهەمهێنان لە كار و پێداویستی شمەك وخزمەتگوزاری – سەرەڕای ئەم خەرجیانەی كە شمەك دوای بەرهەمهێنانی و پێویستی پێیەتی تاكو گەیاندنی بە دەستی بەكاربەر.

هەر زیادەیەك لە خەرجییەكانی تێچووندا دەبێتە مایەی زیادە لە نرخەكاندا و پێچەوانەش ڕاستە. نرخەكان پێویستە كەمترین ڕادە لە تێكڕایی تێچوونە گۆڕاوەكان بدات بۆ ئەوەی دامەزراوەكان لە كارەكانیاندا بەردەوامبن.

### ٢ - هۆكارە ڕامیارییەكان : Political Factors

ڕێ و شوێنی پەیڕەوكراو لە لایەن دەوڵەتەوە كە پەیوەستە بە ئامانجە ڕامیاری و ئابووری و كۆمەڵایەتییەكان بۆ هەر ڕژێمێكی ڕامیاری هۆكارە كاریگەرەكان دەژمێردرێت بۆ دیاریكردنی نرخەكان. بۆ نموونە ڕێو شوێنی دیاریكردن و چەسپاندنی نرخەكان بۆ هەندێك لە شمەك و خزمەتگوزارییەكان دەرئەنجام دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی توانای كڕینی تاكەكان، و یان دابینكردنی داهاتی بەرهەمهێنەرەكان لە ڕێگای دەستەبەركردنی كەمترین

ڕادەی نـرخ بـۆ بەرهەمـەکانیان و دابینکردنـی شمـەکی بەرهەمهێنـەرەکان و کەرەستە خاوەکـان بـە نرخێکـی کـەم، هـەموو هۆکـاری گـرنگ و ڕێوشـوێنی رامیارین کە دەوڵەت بە کاریان دەهێنێـت ئامـانجی ئەوەیـە کـار بکاتـە سـەر نرخەکان.

## ٣ - پلەی کێبڕکێکردن (المنافسة): Competition

ئـەو کێبڕکێکردنـەی کـە لـە بـازاڕدا هەیـە بـەگرنگترین هۆکـار هـەژمار دەکرێـت بـۆ دیـاریکردنی نرخـەکانی شمـەك و خزمەتگوزاریـەکان، چـونکە هۆکاری کێبڕکێ لە دانانی نرخدا لەو سیستەمانەی کە پلانی ناوەندی پەیڕەو دەکـەن لـە بـەڕێوەبردنی ئابووریـەکانیان کـەمترە، چـونکە نرخـەکان بـەپێی ڕێنمـایی و ڕێـو شـوێنێك کـە دەوڵـەت لـە ناوەنـدەوە دەری دەکـات دیـاری دەکرێت. و هەروەها هۆکـاری کێبڕکـێ لـە بەرامبـەر شمەکـە قۆرخکراوەکـان کاریگەری نابێت، چـونکە نرخـەکان لـە لایـەن کۆمپانیـا بەرهەمهێنـەرەکان و قۆرخکراوەکان دیاری دەکرێت.

## ٤-رامیاری دارایی (خەرجیەکان): Fiscal & Polic Expenditure

زیادکردنی رامیاری خەرجیەکانی دەوڵەت لە هـەردوو لایـەنی بەگـەڕو و وەبەرهێناندا. کاردانەوەی گەورەی هەیە لە سـەر ئاسـتی نرخـەکان، چـونکە زیادکردنی خەرجیە گشتییەکان، ڕاستەوخۆ دەبێتە مایەی زیادبوونی خواست لـە سـەر شمـەك و خزمەتگوزارییـەکان و بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ داهـاتی تاکەکان زیاد دەبێ، "کاریگەری دوو ئەوەندە زیاد دەبێت"

(اثر المضاعف Multiplier effect ) ئەگـەر ئـەم زێـدە خواسـتە زیادەیـەکی بەرامبـەر نـەبێت لـە بەرهەمهێنانـدا، دەرئـەنجام دەبێتـە مایـەی زیـادبوونی خواسـتن بـە بـەراورد لـە گـەڵ خـستنەڕوودا و نرخـەکان بـەرز دەبنـەوە. و

پێچەوانەش ڕاستە، کۆنترۆڵکردنی ئاستی نرخەکان لەم حاڵەتاندا بابەتێکی گرنگە پێویستی بە ڕێوشوێن هەیە بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتە خنکێنراوەکان ئەوەش بە ڕێکخستنی گۆڕانی نرخەکان دەکرێت.

## ٥- رامیاری بازرگانی دەرەکی دەوڵەت: Foreign Trade Policy

ئەو رامیاریەی دەوڵەت پەیرەوی دەکات لەبواری"هاوردەوناردەنی" دا کاریگەرە لەسەر ئاستی نرخەکان، چونکە بازرگانی دەرەکی رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە جەختکردن لەسەر نرخەکان لەمیانەی کاریگەری خواستی دەرەکی لەسەر شمەکە ناوەخۆییەکان و ئەو شمەکانەی کە لە دەوڵەتدا خراونەتە ڕوو. بە ئاشکرا دیار دەکەوێت. ئەم خواستە لە بەرزبوونەوەو دابەزین دایە لە میانەی زێدەکردنی نێردراوەکان یان بەکاربرەکان و یاخود دابەزینیان، هەروەها هاوردەکان یەکێکە لە هۆکارەکانی بەرزبوونەوەی نرخی شمەك و خزمەتگوزاریەکان بەم پێیەی کە ڕێگەیەکە بۆ گواستنەوەی هەڵاوسانی جیهانی، بۆیە کار دەکاتە سەر ئاستی نرخەکانی ناوخۆ بە تایبەتی لەم وڵاتانەی کە ئابووریەکانیان پشت بەجیهانی دەرەوە دەبەستی وەك لە زۆربەی وڵاتە تازە پێگەشتووەکاندا.

## ٦- رامیاری نەختینەیی (دراو): Monetary Policy

رامیاری نەختینەیی (بە رامیاری متمانە کردنیشەوە) بەنرخەکان بەستراوتەوە لە ڕێگای کاریگەری ڕێژەی دراو لە ئاڵوگۆڕکردندا (خستنەڕووی دراو) دەکرێ، دەتوانرێ ئەم سیاسەتە بە کاربهێندرێت بۆ هاندانی تاکەکان بۆ پاشەکەوتکردن و وەبەرهێنان و یان کەمکردنەوەی ئاسانکاری بەنکی بە شێوە جیاجیاکانی ئەمەش دەبێتە مایەی کەمبوونەوەی قەبارەی دراو لە ئاڵوگۆڕکردندا.

## ٧- هۆكارە كۆمەڵایەتییەكان : Social Factors

هۆكارە كۆمەڵایەتییەكان كار دەكەنە سەر نرخ و ئاراستەكانی ئەمەش لەرێگەی بەیەكتر بەستنەوەی خواست لە سەر شمەك و خزمەتگوزارییەكان و كاریگەری لەسەر ئەو شێوازە بەكاربراوەی كە هەیە.گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

أ- قەبارە و پێكهاتەی دانیشتوان بە پێی تەمەن و رەگەزە.

ب- هاتوچۆی دانیشتوان لە ناوخۆ و دەرەوەدا.

ج- ئەو شێوازە بەكاربردنەی كە پەیوەستە بە دابونەریتی كۆمەڵایەتییەوە.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

**پ١/ پێناسەی ئەم زاراوانە بکە:**

بەهای بەکارهێنان –بەهای ئاڵوگۆڕکردن – سوودی سنووردار– سوودی سەرجەم.

**پ٢/ وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە :**

١. بەگوێرەی بیروڕای کلاسیك چۆن بەهای ئاڵوگۆڕکردن دیاری دەکرێ؟

٢. باسی بۆچوونی کارڵ مارکس بکە سەبارەت بە بەها؟

٣. باسی ئەو رەخنانە بکە کە ئاراستەی بیردۆزی کارکرا بۆ بەها ؟

٤. ڕێسای کەمبوونەوەی سوود شرۆڤە بکە.

٥. بەها لە لایەن جیفونزەوە چۆن شیکراوتەوە (شرۆڤەکریە) ؟

٦. چۆن دەتوانین بەهای هەموو یەکەکانی شمەکێك لەسەر بنەمای سوودی دوا یەکە دیاری بکەین؟

٧. چۆن نرخ دیاری دەکرێ لە سستیەمی ئابووری سەرمایەداری؟

٨. کۆمەلێك هۆکار کاردەکەنە سەر نرخ. ئەو هۆکارانە چین؟

٩. لەبەرچی بۆچوونی دیڤید ڕیکاردو لەبارەی بەها بە ( **بیردۆزێك بۆ تێچوونەکانی بەرهەمهێنان دادەنرێ؟**)

١٠– بۆچی ئابووریناسانی کلاسیك بەهای شتێکیان بەو کەڵکەی کە لەو شتە وەردەگیرێت نەبەستۆتەوە؟

**پ٣/ ئەم ڕستانەی خوارەوە ڕاستن ( ✓ ) یا چەوتن ( X )دیاریان بکە:**

١. پەیوەندی نێوان شتێك و کەڵکەکەی: ڕاستەوخۆ لە نێوان بەهاکەی و سەرجەم کەڵکەکەی دا نییە، بەڵکو لە نێوان بەهاکەیو کەڵکی سنووردارەکەیەتی.

٢. لاری چەماوەی خواست لە سەرەوە بۆ خوارەوە و لە چەپەوە بۆ راست بۆ بنەمای زیادبوونی سوودی سنوورەکی دەگەڕێتەوە.

٣. بیردۆزی سوودی سنووردار لایەنی خستنەرووی لە شیکردنەوەی بەها فەرامۆش کردووە.

٤. کاریگەری هۆکاری کێبڕکێ لەسەر نرخ لەم سیستەمانە کە پلانی ناوەندی پەیڕەو دەکەن لە بەڕێوەبردنی ئابوورییەکانیان.

٥. خەرجی بەرهەمهێنان بە گۆڕینی قەبارەی بەرهەم دەگۆڕدرێت بەمەش یەك خەرجی بەرهەمهێنان نییە بۆ هەر شمەکێك بەبێ لەبەرچاوگرتنی بڕی بەرهەم هێنانەکە.

٦. بەهای هەر شمەکێك بۆ تاك بە پێی ئەو کەڵکە کە لە دوایین یەکەی بەکارهێنراو وەریگرتووە دیاری دەکرێ.

## سەرچاوەکانی بەشی دووەم


١. توني همفريز، المال والقيمة يجددان حياتك، تعريب احمد العمري، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٢.

٢. د. حسين عمر، مقدمة علم الاقتصاد : نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣. د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣.

٤. د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هاشم و د. محمد عبدالعزيز عجمية، مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

٥. د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٣.

٦. د. عبدالقادر محمد عبدالقادر عطية، التحليل الاقتصادي الجزئي بين النظرية و التطبيق، الدار الجامعية،الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٧. د. محمد علي الليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتصاد : الاقتصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

٨. د. علي يوسف خليفة و د. احمد زبير جعاطة، النظرية الاقتصادية : التحليل الاقتصادي الجزئي، دون، ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

٩. د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٠. يوسف كمال محمد، فقه أقتصاد السوق: النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النشر للجامعات، القاهرة،١٩٩٨.

١١. سوزان لي، أبجدية علم الاقتصاد، ترجمة خضر نصار، مركز الكتب الاردنى عمان،١٩٨٨.

12. Michael A. Leeds، Peter Von Allen & Richard C. Schiming، " Econo - mics "، Pearson Education Inc.، Boston، 2006.
13. Jeffrey M. Perloff، " Microeconomics "، Fourth Edition، Pearson Int'l Edition، Boston، 2007.
14. Robert J. Gordon، " Macroeconomics "، 10th Edition، Pearson Inc.، New York، 2006.
15. Stanley L. Brue & Campbell R. McConell، " Essentials of Economics "،McGraw – Hill Inc.، Boston، 2007.
16. Damodar N. Gujarati، " Essentials of Economics "، Third Edition، McGraw – Hill Inc.، Boston، 20006.
17. Stephen L. Slavin، " Economics "، 8th Edition، McGraw – Hill، New York، 2008.
18. Bradley R. Schiller، " The Microeconomics Today "، 10th Edition، McGraw – Hill، Boston، 2006.
19. Bradley R. Schiller، " The Macroeconomics Today "، 10th Edition، McGraw – Hill، Boston، 2006.
20. David D. Friedman، " Price Theory "، 2nd Edition، South – Western Publishing Co.، Cincinnati، 1990.

# بەشی سێیەم

## بـــازاڕەکان
## THE MARKETS

### پێناسەی بازاڕ:

بـــازاڕ: چوارچـێوەیەکە کۆمـــەڵێك کڕیـــار و فرۆشـــیار لــە خــۆ دەگرێــت و پەیوەندییـەکی پتـەویان هەیـە و بـەبێ هـیچ بەربەستێك ئـاڵوگۆڕ لـە نێـوان یەکتری دەکەن.

لەم پێناسیەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا بازاڕ چوار ڕەگەز لەخۆ دەگرێت:

١. بوونی شمەکێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن.

٢.بوونی کڕیار.

٣.بوونی فرۆشیار.

٤.ئاڵوگۆڕکردن بە ئازادی بەبێ بەربەست.

ئەو هۆکارانەی چوارچێوەی بازاڕ دیاری دەکەن ئەمانەن :

١– سروشتی شمەك.

٢– داب و نەریتی باو.

٣– ئاسانی گەیاندن.

٤– بەربەستی گومرگی و چەندایەتی.

## بنەما گرنگەکانی بازاڕ:

بەرلەوەی شێوەکانی بازاڕ شیبکەینەوە پێویسە ئاماژە بۆ ئەم بنەما گرنگانە بکەین کە کار دەکەنە سەر شێوەی بازاڕ:

١- گونجانی بەرهەمەکان و پلەی جێگیربوونیان.

٢- ژمارەی فرۆشیاران لەڕووی کەمی و زۆری.

٣- ژمارەی کڕیاران لە رووی کەمی و زۆری.

٤- رادەی ئەو هاریکارییەی کە لە نێوان کڕیار و فرۆشیار هەیە، واتە تا چەند پەیوەندییە تایبەتیەکان کار دەکەنە سەر ئەو نرخەی کە لە بازاڕ هەیە.

## شێوەکانی بازاڕ: *The Types Of Markets*

بازاڕ دوو شێوەی سەرەکی هەیە:

### یەکەم - بازاڕی کێبڕکێی تەواو: *Free Competition Market*

خەسڵەتەکانی ئەم بازاڕە ئەمانەن:

١- بوونی ژمارەیەکی زۆر لە بەرهەمهێنەران و کڕیاران.

٢- گونجاندنی بەرهەم و شمەکەکان.

٣- کەمی قەبارەی خستنەڕوو بۆ هەر بەرهەمێك و کەمی قەبارەی خواستن بۆ هەر بەکاربەرێك بەبەراورد لە گەڵ خستنەروو و خواستی بازاڕ.

٤- هیچ جۆرە بەربەستێك لە سەر نرخ دانەنراوە.

٥- ئازادی لە هاتنە ناوەوە و چوونە دەرەوە لە بازاڕدا.

٦- زانیاری تەواو لەسەر بارودۆخ و چۆنیتی بازاڕ هەیە بەتایبەتی لەبارەی نرخەکانی کڕین و فرۆشتن.

٧- نەبوونی تێچوونی گواستنەوە، چونکە بوونی ئەم تێچوونە مانای هاوتایی نییە لە نرخەکان، بەڵکو دوو جۆرە نرخ هەیە نەوەك یەك نرخ، وئەگەر ئەم تێچوونەش هەبێت ئەوا پێویستە بەلایەنی کەم هاوشێوە بێت لەنێوان فرۆشیاران لەلایەك وکڕیاران لەلایەکی ترەوە. واتا نەمانی ئەو جیاوازییە کەوا لە ئاکامی تێچوونی گواستنەوەدا دێتە ئاراوە)).

**تێبینی:** ئەگەر تەنها پێنج مەرجەکانی یەکەم هەبوون ئەوا بەم بازارە دەڵێن بازاڕی رکابەرایەتی(کێبڕکێ)ی پوخت، بەلام کاتێك هەرحەوت مەرجەکە هەبوون ئەم بازارە پێی دەڵێن بازاڕی رکابەرایەتی(کێبڕکێ)ی تەواو.

## دووەم -بازاڕی کێبڕکێی ناتەواو:

ئەم بازارە بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوە دابەش دەکرێت:

### ١. بازاڕی قۆرخکراوی ڕەها:

مەرجەکانی قۆرخکراوی ڕەهایی لە فرۆشتندا :

أ – یەك بەرهەمهێن هەیە.

ب – ئەم بەرهەمهێنە کۆنترۆڵی خستنەڕووی شمەکەکان دەکات.

جـ– چەماوەی خستنەڕووی قۆرخکار بریتییە لە خاڵێك یان چەماوەیەك کە نەرمی نانوێنێ.

## مەرجەکانی قۆرخکاری ڕەها لە کڕیندا :

١– یەك کریار هەبێت.

٢– دەست بەسەر خواست دادەگرێت.

٣– چەماوەی خواستەکەی خاڵێکە یان نەرمی نواندنی نییە.

## ٢- بازاڕی قۆرخکراوی کەم:

**مەرجەکانی قۆرخکراوی کەم لە فرۆشتندا:**

أ – ژمارەی فرۆشیار یان بەرهەمهێنەران کەمە.

ب – بوونی پەیوەندییەکانی ئاڵوگۆڕکردن واتە هەر بەرهەمهێنێك رەچاوی کاردانەوەی بەرهەمهێنەکانی دیکە دەکات.

– بە بوونی دوو بەرهەمهێن دەڵێن بازاری قۆرخکراوی دوولایەنی.

– نرخەکان لەم بازاڕەدا جیاجیان، بەڵام بەرهەمەکان لەیەك دەچن یان بە تەواوی لێك ناچن وئەگەر شمەکەکان لەیەك بچن پێی دەڵێن ئەم قۆرخ کراوە قۆرخ کراوی کەم و ناتەواوە یان جۆراوجۆرە.

**مەرجەکانی قۆرخکراوی کەم لە کڕیندا:**

ژمارەی کریاڕان کەمە.

هەر یەکێکیان کاریگەری خۆیان لە سەر نرخ هەیە.

## ٣. بازاڕی کێبڕکێی قۆرخکردن:

**مەرجەکانی قۆرخکردن لە فرۆشتندا:**

١– بوونی ژمارەیەکی زۆر لە فرۆشیاران یان بەرهەمهێنەران.

٢– هەر بەرهەمهێنێك یان فرۆشیارێك دەتوانێت خۆی لەوانی تر جیا بکاتەوە.

٣– جیاوازی هەیە لە نرخ ((هەر بەرهەمهێنێك دەتوانێت خۆی جیا بکاتەوە لە رێگای رێکلام، شوێن، شێوازی فرۆشتن.... هتد)).

**مەرجەکانی کێبڕکێی قۆرخکردن لە کڕیندا:**

١– بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کڕیار.

٢– هەندێك لە کڕیاران (بۆ نموونە دابەشکەران) خۆیان دەتوانن جیاوازی لەنێوان فرۆشیاران بکەن، بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ یەکێکیان پێ باشترە لەوانی تر.

## هاوسەنگی بەرهەمهێن لە بازاڕی بەربەرەکانێی تەواوەتیدا :

بەرهەمهێن هاوسەنگ دەبێت کاتێك داهاتی سنوورەکی و تێچوونی سنوورەکی یەکسان بن و دەبێ تێچوونی سنوورەکی بەرز دەبێتەوە.

لەم بازاڕەدا بەرهەمهێن بەردەوام دەبێت لەسەر بەرهەمهێنان و فرۆشتن تا ئەو کاتەی کە داهاتی سنوورەکی یەکسان بێت لەگەڵ تێچوونی سنوورەکی، چونکە ئەم دۆخە بەرزترین ئاست لە قازانجی بۆ دابین دەکات و لەم نموونەیەی خوارەوەدا هاوسەنگی لە دانەی یازدەدا دروست دەبێت، چونکە داهاتی سنوورەکی و تێچوونی سنوورەکی یەکسانن بە (٢٠)، و ئەگەر دانەی دوانزە بەرهەم بهێنێت ئەوا داهات سنوورەکی کەمتر دەبێت لە تێچوونی سنوورەکی (٢٠ < ٢٤) بەمەش قازانج کەم دەکات لە (٣٠) بۆ (١٦).

| دانە | نرخ | سەرجەمی داهات | تێکڕای داهات | داهاتی سنورەکی | سەراپای تێچوون | تێچوونی سنووورەکی | قازانج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٨ | ٢٨ | ٨- |
| ٢ | ٢٠ | ٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٥٥ | ٢٧ | ١٥- |
| ٣ | ٢٠ | ٦٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٧٤ | ١٩ | ١٤- |
| ٤ | ٢٠ | ٨٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٨٩ | ١٥ | ٩- |
| ٥ | ٢٠ | ١٠٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٠٠ | ١١ | سفر |
| ٦ | ٢٠ | ١٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١١٢ | ١٢ | ٨ |
| ٧ | ٢٠ | ١٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٢٤ | ١٢ | ١٦ |
| ٨ | ٢٠ | ١٦٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٣٨ | ١٤ | ٢٢ |
| ٩ | ٢٠ | ١٨٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٥٣ | ١٥ | ٢٧ |
| ١٠ | ٢٠ | ٢٠٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٧٠ | ١٧ | ٣٠ |
| ١١ | ٢٠ | ٢٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٩٠ | ٢٠ | ٣٠ |
| ١٢ | ٢٠ | ٢٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢١٤ | ٢٤ | ١٦ |

## هاوسەنگی بەرهەمهێن لە بازاڕی قۆرخکاری ڕەهادا:

بەرهەمهێن لەم بازاڕەدا بەردەوام دەبێت لە بەرهەمهێنان و فرۆشتن تا ئەو کاتەی تێچوونی سنوورەکی و داهاتی سنوورەکی یەکسان بێت، چونکە بەرزترین ئاستی قازانج بەدەست دێنێت، لەم نموونەیەی خوارەوەدا لەم نموونەیەی خوارەوەدا باشترین ئاست بۆ بەرهەم هێنان دانەی شەشەمە تیایدا داهاتی سنوورەکی یەکسان دەبێت بە تێچوونی سنوورەکی (١٢=١٢) و بەرزترین ئاستی قازانج بەدەست دێنێت کە یەکسانە بە ٢٠ وە ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر بەرهەمهێنان داهاتی سنوورەکی کەم دەکات و تێچوونی سنوورەکی زیاد دەکات، بەمەش قازانج دەست دەکات بە کەمبوونەوە هەروەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا دیارە:

| دانە | نرخ | سەرجەمی داهات | تێکڕای داهات | داهاتی سنورەکی | سەراپای تێچوون | تێچوونی سنوووڕەکی | قازانج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٣٢ | ٣٢ | ٣٢ | ٣٢ | ٢٨ | ٢٨ | ٤ |
| ٢ | ٣٠ | ٦٠ | ٣٠ | ٢٨ | ٥٥ | ٢٧ | ٥ |
| ٣ | ٢٨ | ٨٤ | ٢٨ | ٢٤ | ٧٥ | ٢٠ | ٩ |
| ٤ | ٢٦ | ١٠٤ | ٢٦ | ٢٠ | ٨٩ | ١٤ | ١٥ |
| ٥ | ٢٤ | ١٢٠ | ٢٤ | ١٦ | ١٠٠ | ١١ | ٢٠ |
| ٦ | ٢٢ | ١٣٢ | ٢٢ | ١٢ | ١١٢ | ١٢ | ٢٠ |
| ٧ | ٢٠ | ١٤٠ | ٢٠ | ٨ | ١٢٤ | ١٢ | ١٦ |
| ٨ | ١٨ | ١٤٤ | ١٨ | ٤ | ١٣٨ | ١٤ | ٦ |
| ٩ | ١٦ | ١٤٤ | ١٦ | صفر | ١٥٣ | ١٥ | -٩ |
| ١٠ | ١٤ | ١٤٠ | ١٤ | -٤ | ١٧٠ | ١٧ | -٣٠ |

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

**پ١– پێناسەی ئەم زاراوانە بکە:**

بازاڕ. – خاڵی داخراو.

**پ٢– وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:**

١ – ڕەگەزەکانی بازاڕ بژمێرە.

٢ – ئەو هۆکارانە چین کە چوارچێوەی بازاڕ دیاری دەکەن؟

٣ – ئەو بنەما گرنگانە بژمێرە کە شێوەی بازاڕی پێ دیار دەکرێ.

٤ – شێوەکانی بازاڕ چین؟

٥ – شێوەکانی بازاڕی قۆرخکاری ڕەها دیاری بکە.

٦ – چۆن بەرهەمهێن لە بازاڕی کێبڕکێی تەواودا هاوسەنگ دەبێت لەماوەی کورت و درێژدا؟

# سەرچاوەکانی بەشی سێیەم


١. بـول أ. ساموبلـسون و ويليـام د. نوردهـاوس، الاقتـصاد، الطبعـة الخامـسة عـشرة، ترجمة: هشام عبدالله، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠١.

٢. د. حسين عمر، مقدمة في علم الاقتصاد : نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣. د. عبدالكريم كامل عبدالكاظم، الـنظم الاقتـصادية المقارنـة، جامعـة الموصـل، مديريـة دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٨.

٤. د.مصطفى رشدي شيحة، علـم الاقتـصاد مـن خـلال التحليـل الجزئـي، الـدار الجامعيـة، الاسكندرية، ١٩٨٦.

٥. د. كريم مهدي الحسناوي، مبادئ علم الاقتصاد، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩.

٦. طـاهر حيـدر حـردان، مبـادئ الاقتـصاد، الطبعـة الاولى، دار المـستقبل للنـشر والتوزيـع، عمان، ١٩٩٧.

٧. د. محـسن كـاظم، تـاريخ الفكـر الاقتـصادي: ابتـداءً بنـشاته وانتهـاءً بالماركـسية، الطبعـة الاولى، ذات السلاسل، الكويت، ١٩٨٩.

٨. د. عبـدالقادر محمـد عبـدالقادر عطيـة، التحليـل الاقتـصادي الجزئـي بـين النظريـة و التطبيق، الدار الجامعية،الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٩. د. محمد علي الليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتـصاد: الاقتـصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

١٠. د. علـي يوسـف خليفـة و د. احمـد زبـير جعاطـة، النظريـة الاقتـصادية : التحليـل الاقتصادي الجزئي، دون، ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

١١. د. كامـل البكـري، الاقتـصاد التجميعـي، مؤسـسة شـباب الجامعـة للطباعـة والنـشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٢. يوسف كمال محمد، فقه اقتصاد السوق : النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النـشر للجامعات، القاهرة، ١٩٩٨.

١٣. سوزان لـي، ابجديـة علـم الاقتـصاد، ترجمـة : خـضر نـصار، مركـز الكتـب الاردنـي، عمان، ١٩٨٨.

١٤. د. احمد حسن جاوشين، النظرية الاقتصادية : الاقتصاد الجزئي التحليلي، جامعة صلاح الدين، مطبعة الجامعة، اربيل، ٢٠٠٠.

١٥. د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣.

١٦. د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٣.

١٧. د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هاشم و د. محمد عبدالعزيز عجمية، مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

# بەشی چوارەم

## دراو ( پـــارە )

## MONEY

پەرەســـەندنی پێداویـــستییە مرۆڤایەتییـــەکان وفراوانبـــوونی ئارەزووەکانی و گەشەکردنیان، بۆتـە هـۆی سـەرهەڵدانی دراو، دوای ئـەوەی سـەوداکردن (گۆڕینـەوە: **المقايضة** Barter) نـەیتوانی ئـەو پێویـستییانە بـە سووکی وئاسانی دابین بکات، چونکە ئەو شێوازە لە بار وکرداری نەبوو، بۆیە دراوەکان بوونە ئامرازێکی گرنگ کە تاک و کۆمەڵگە پشتی پێ دەبەست وەك پێوەرێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن .

بـە ئـامرازێکی گونجـاو دادەنـرێ بـۆ هـەڵگرتنی بـەهاکان دوای ئـەوەی کـەوا خوودی دراو بەهاکەی لەخۆگرتبوو وهێزی شت پێ کڕینی خۆی بۆماوەیـەکی دیاریکراو پاراستبوو،وئامرازێکە بۆ پاکۆکردن وپێوەرێکی هاوبەشە بۆ بـەهای شمەکە جۆرا وجۆرەکان هاوکات ئەم هەل و دەرفەتە دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی ئارەزووی کریاران وفرۆشیاران بگونجێنی و نزیکیان بکاتەوە.

هەروەها درواوەکان شێوەی جیا جیایان هەبووە، شـێوەی یەکـەمی " دراوی شمەکییە" کە خۆی لە قەبووڵکردنی جۆرە شمەکێکی دیـاری کـراو دەنـوێنێ لە لایەن تاکەکان بەرامبەر وازهێنانیـان و دەسـت بـەردانیان لـە شمەکـەکانی تردا،جۆری ئەم شمەکە بەکارهێنراوانە جیاجیابوون بۆ ئەوەی ببنە پێوەر لـە ئاڵوگۆڕکردندا بە پێی جیاوازی کۆمـەڵگاکان وئـەو قۆناغـە مێژووییـە یـەك لـە دوای یەکانەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕ بووە (بـەروبووم، و کانزاکان: زیو یان زێڕ و کانزاکانی دیکە) تا دراوەکان ئەم شێوەی ئێـستای وەرگرت کە دراوی کاغەزە.

## پێناسەی دراو:

**دراو کۆمەڵێك پێناسەی هەیە، لەوانە:**

١- هەر شتێك بە شێوەیەکی گشتی لە لایەن خەڵکەوە پەسند بکرێت وەك پێوەرێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن و دانەوەی قەرزەکان پێی دەگوترێ دراو.

٢- دراو بریتییە لە هەر شمەکێك کە ئەرکی دراو راپەڕێنێ.

گرنگترین ئەرکەکانی دراو بریتین لە: هۆکارێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردنو، پێوەرێکە بۆ بەهاکان و یەکەیەکە بۆ حیساب کردن، وکۆگایە بۆ بەهاکان، و ئامرازێکە بۆ پاشەکەوتکردن، و هۆیەکە بۆ پێدانی پارە دواخراوەکان و پاکۆ (تسویە) کردن.

لێرەدا بەدەردەکەوێت کە دراو بە شێوەیەکی راستەوخۆ وەك خوودی دراو بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانی مرۆیی بە کاربردەیی (استهلاکی) و بەرهەمیدا داوا ناکرێ، بەڵکو داوا دەکرێت بە مەبەستی بەکارهێنانی لە بە دەستهێنانی کەڵکێکی (منفعة) بەکاربردن بێت یان بەرهەمداریدا.

واتا دراو پیویستییە مرۆییەکان لە بەکاربردنو بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەستەبەر دەکات لە ڕێگای بە کارهێنانی وەك ئامرازێك بۆ بە دەستهێنانی شمەك وخزمەتگوزاریەکان.

## شێوەکانی دراو: Types Of Money

دراوەکان شێوەی جیاجیایان هەیە بە پێی:

١. ئەو ماددەیەی کە دراوەکەی لێی دروستکراوە.

٢. ئەو لایەنەی کە دەریدەکات.

٣. ئـەو پەیوەندییـەی کـە لـە نێـوان بـەهای یەکـەی دراوەکـە وەکـو دراو و بەهاکەی وەکو ماددە(شمەك). لەم سۆنگەیەوە شـێوەکانی دراو ئـەمانن: دراوی شمەك، دراوی کانزا، دراوی کاغـەز، و ئـەو دراوەی کـە حکومـەت و بـانکی ناوەنـدی دەریـدەکات، هـەروەها ئـەو دراوانـەی کـە بانکـەکان دەریدەکەن (دراوی سپاردەکان: نقود الودائع).

### ١- دراوی شمەك: Commodity Money

لە بەرەبـەیانی مێـژووەوە زۆر لـە شمەکـەکان وەك پێوەرێك بـۆ بـەها بەکارهێنراون لـە بـواری ئاڵوگۆڕکردنـدا. دیـاریکردنی ئـەو شمەکانـە لەلایـەن کۆمەڵگاکان جیاوازبووە بە پێی جیاوازی ژینگەکەیان، بێگومان لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا. ئەم شمەکانە و گونجانیـان لەگـەڵ سـامان و دارایـی ئەم سەردەمەدا و هەروەها ئاستی بیرکردنەوە وئارەزووەکان وداب ونـەریت و سروشتی دروشمە ئاینییەکان کە باو بـوون، بـۆ نموونـە مێـژووی دراو بۆمـان دیـاری دەکـات کـە (گریکـەکان) **ئاژەڵیـان** وەك دراو بـەکارهێناوە، هیندییـە سوورەکان تووتنیان بەکارهێناوە، و چینیەکانیش " چەقۆ ".

### ٢- دراوی کانزا : Metal Money

دوای ئەوەی ئادەمیزاد کانزاکانی دۆزیەوە و خەسڵەتەکانی زانی بە مەبەستی دراو بە کاری هێنا. یەکەم جار برۆنز و مسی کردە دراو، دواتر زیو، و لە دوا قۆناغەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی زێڕی(ئالتون) بەکارهێنا، چونکە زێڕ و زیو ژەنگ هەڵناهێنن و هەڵگرتن و پاشەکەوتکردنی ئاسانە و دەکرێ بەش بەش بکرێت سەرەڕای ئەوەی دەگمەنیشن.

### ٣- دراوی کاغەز : Paper Money ( Banknote )

ئەم دراوە کاغەزانە لە سێ لایەنەوە دەردەکرێن : میریی، بانکی ناوەندی یان بانکی تایبەت.

١- ئەم دراوانەی کە میریی دەری دەکات بە پێی یاسا دیاریکراون بە دراوێکی دیکە دەگۆڕدرێن بە پێی داخوازیەکان، ئەم دراوانە دەکرێ بگۆڕدرێن یان نەگۆڕدرێن.

٢- بەڵام دراوی کاغەزی کە بانکی ناوەندی دەری دەکات کە لە زۆربەی وڵاتاندا هەیە یەکەی دراوەکە دەکرێ بگۆڕدرێت بۆ دراوێکی تر بە پێی یاسا و ڕێنماییەکان کە کردارەکانی دراو گۆڕینەوەی بیانی ( معاملات الصرف الاجنبی ) ڕێك دەخەن.

٣- بەڵام ئەم دراوانەی کە بانکە تایبەتیەکان دەری دەکەن لە زۆربەی وڵاتاندا وەستێنراون، بەڵام لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەر ماوە.

## ٤- دراوی بانك:

بریتییە لە دراوی سپاردن یان پێیان دەوترێت (دراوی چەکەکان) کە لە میانەیاندا بانکەکان، هەروەها تاکەکان بە شێوەیەکی بەرچاو مامەڵەیان پێ بکات لە بەر ئەم خەسڵەتە پۆزەتیڤانەیان (چاکانەیان) کە هەیانە لە ئاسانی هەڵگرتن و گواستنەوە و مامەڵە پێ کردنیان، سەرەڕای ئەوەش کە بواری بەش بەش کردنی نییە، بۆیە پێویستمان بە ژمارە و بەشی بچووك نییە.

جیاوازی دراوی بانك لەگەڵ دراوەکانی دیکە ئەوەیە کە قەوارەیەکی ماددی و هەست پێکراوی نییە، هەر چەندە قەرزارەکان یان کڕیارەکان ناتوانن قەرزەکەیان یان فرۆشیارەکان پابەند بکەن لە سەر قەبووڵکردنی لە پاککردنەوەی قەرزەکان پاکتاوکردن و دانەوەی نرخی شمەکە کڕاوەکان، ئێمە دەبینین ئەم جۆرە دراوە لایەنێکی گەورە لە خستنەڕووی دراودا لە وڵاتە پێشکەوتووەکان پێك دێنێ.

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی نێوان بەهای دراو وەك دراو و بەهای وەك شمەك ئەوا دراوەکان دابەش دەکرێن بۆ:

## ١- دراوی پێوانەیی:

بریتییە لە دراوێك پێکهاتەیەکی مادی تەواوی هەیە، چونکە بەهاکەی لە بازاڕدا وەك شمەك بەرامبەر بەهاکەیەتی هەرچەندە ئەم جۆرە دراوە لە بازاڕەکاندا نەماوە،کەچی هەندێ خەڵك تا ئێستا بە باشترین جۆرەکانی دراوی دادەنێن.

### ٢- دراوی متمانەیی:

ئەم دراوانەن کە بەهاکانیان لە ناوەڕۆکدا زۆر گەورەترە لە بەهای ئەو ماددەیەی کە لێی دروستکراوە. گشت ئەم دراوانەی کە لەکاتی ئیستادا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێ دراوی متمانەین (کاغەز بێت یان کانزا هەرزانەکان بێت وەکو مس و فافۆن و نیکل... هتد).

## ئەرکەکانی دراو: Money Functions

دراو دوو ئەرك دەبینێت : **ئەرکی یەکەمی** پێی دەوترێت (ئەرکی سەرەکی) یان بنەڕەتی، چونکە پێوەرێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردن و پێوەری بەهایە و یەکەی حیساب کردنە، **ئەرکی دووەمی** پێی دەوترێت (ئەرکە داتاشراوەکان) و یان لاوەکیەکان کە گوزارشتە لەوەی دراو کۆگای بەهاکانە و ئامرازێکە بۆ پاشەکەوت کردن، هەروەها ئامرازێکە بۆ پێدانی دواخراوەکان و پاکۆکردن. دەکرێ ئەرکەکانی دراو بە وردەکاری ڕوون بکرێتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

### ١- دراو هۆکارێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردن:

ئەم ئەرکە یەکەم ئەرکە کە دراو کردویەتی و تا ئێستاش دەیکات، ئەمەش دوای مامەڵەکردن بە شێوازی سەوداکردن(شت بە شت) هاتۆتە کایەوە، لە سایەی ئەم ئەرکەدا لە قۆناغی یەکەمی مامەڵەکردن شمەکەکان بە دراو دەگۆڕدرانەوە کەچی لە قۆناغی دواتر گۆڕینەوەی دراو بوو بە شمەکەکانی تر.

دەتوانین ئەم ئەرکە لە میانەی مامەڵەکردنی ڕۆژانەماندا تێبینی بکەین. کەسەکان مووچە و کرێیەکانیان ڕۆژانە یان مانگانە لەبەرامبەر

پێشکەشکردنی رەنجەکانیان وەردەکرن، بەڵام هەموو داهاتەکانیان لە کاتی وەرگرتنیاندا خەرج ناکەن — بەڵکو کرداری خەرجکردن لە ماوە و کاتی یەك لە دوای یەکدا و بە بەردەوامی و تا رادەیەك لێك دوور ئەنجام دەدرێت (سەرەتای وەرگرتنی داهات و تا کۆتایی خەرج کردنەکە).
ئەم ئەرکەی دراو لە سروشتی دراوەکە کەوا قەبووڵکراوە لە نێوان لایەنە مامەڵە پێکراوەکاندا وەك ئامرازێکی گونجاو بۆچارەسەرکردنی ئاڵوگۆرکراوەکان و قەرزەکاندا،بۆیە بە دراو دەوترێت (هێزی کڕین).

## ٢- دراو پێوەرە بۆ بەها و یەکەیەکە بۆ حیساب کردن:

لە بنەڕەتدا دراو بۆ ئەوە دانراوە نرخ و بەهای شمەك وخزمەتگوزارییەکان دیاری بکات. بە واتایەکی دیکە دەکرێ بەهای شمەك وخزمەتگوزاییەکان بۆ پێوەرێکی هاوبەش بگەڕێندرێنەوە کە ئەویش دراوە، لەسەر ئەم بنەمایە بەراوردی رێژەیی لە نێوان بەهای شمەك وخزمەتگوزارییە جیاجیاکان ئەنجام دەدرێت. کاتێك کە دراو بە ئەرکی پێوەری بەهاکان هەڵدەستێت پێویستە بەهای دراو تا رادەیەك چەسپاو وجێگیربێت، چونکە ناکرێ تا سەر ئەم بەهایە چەسپاو و جێگیر بمێنێتەوە.

مەبەست لە بەهای دراو هێزی کڕینەکەیەتی کە گوزارشتە لە بڕی ئەو شمەك وخزمەتگوزاریانەی کە دەتوانرێت بە دەست بهێندرێت لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕکردنی لەگەڵ یەك یەکەی دراو لە ماوەیەکی دیار کراودا.

لە ڕوانگەی ئەم ئەرکەوە دەکرێ دراو ئامرازێکی گونجاو بێت بۆ حیسابکردن، چونکە کرداری ژمێرکاری ئاسان دەکات بۆ ئەوەی هەڵبستێ بە کاری جۆراوجۆر و جیاجیاکان لە قەبارە و بەها و کێش، پرۆژە و کۆمپانیا و دامەزراوەکان هەڵدەستن بە ئامادەکردنی بوودجەکانیان ئەویش لە ڕێگای خەملاندنی ئەو شتانەی هەیەتی و ئەو شتانەی کە دەیەوێ بە پشت بەستن بە دراو دەبێ وەك ئامرازێکی حیسابکردن.

## ٣- دراو کۆکەرەوەی بەهاکانە و ئامرازێکە بۆ پاشکەوتکردن:

ئـەم ئەرکـەی دراو داتاشـراوە لەبـەر ئـەوەی بـەهای شمەکـەکان بـۆ ماوەیەکی درێژ ناکرێ بپارێزرێت، چونکە دووچاری فـەوتان و تێکچوون دێـن ویان ناتوانرێـت هـەڵ بگرێـت، بۆیـە دراو بـەم ئەرکـە هەڵدەسـتێت بـەهاکانی سـەرجەم شمـەك وخزمەتگوزاریـەکان بـە کۆگـا دەکـات هاوکـات دەکـرێ لـە جیاتی شمەکە ماددەیی و نامادديیەکان کـە ئارەزووەکـانی تـاك و گروپـەکان دەستەبەر دەکات تابەکار بهێندرێن.

لەبەرئەوەی دراو هەر دوو کرداری کڕین و فرۆشتن لێك جیـا دەکاتـەوە لەکاتی ئاڵوگۆڕکردندا هاوکات هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی بەهای شمەکـەکان و بەدەست هێنانیان لە ماوە و کاتەکانی دواتردا – کە ئەمەش وادەکـات ببێتـە ئامرازێـك بـۆ پاشـەکەوتکردن – بـەجۆرێك هـەر تـەنها دواخـستنی کـرداری ئاڵوگۆڕکردنی دراو بەرامبەر شمەك و خزمەتگوزارییەکان بۆ ماوەیـەکی دواتـر لە ئایندەدا ئەمە مانای وایە کە دراو ئەرکی پاشکەوتکردنی بەجێ گەیاندووە، ئـەویش بـەهۆی هـەڵگرتنی بـەهای شمـەك و خزمەتگوزارییـەکان لـەکاتی دیاریکراو، لێرەدا گرنگی چەسپاندن و جێگیربوونی ڕێژەی بەهای دراو بەدیار دەکـەوێ بـۆ ئـەوەی دوور بێـت لـە دابـەزینی هێـزی شـت پـێ کڕینـی بۆیـە فاکتـەرێکی گونجـاوترە لـە وانـەی تـر بـۆ ئـەوەی ئـەرکی پاشـەکەوتکردن لەئەسـتۆ بگـرێ، ئـەویش بـەهۆی بـوونی متمانـەی (سـیولە) تـەواو لـە چـاو جۆرەکانی دیکە کە لە بارن بۆ پاشەکەوتکردن.

## ٤- دراو ئامرازێکە بۆ دانەوەی (گێڕانەوەی) دواخراوەکان:

ئـەم ئەرکـەی دراو کـە داتاشـراوە توانـای دراو بـە دیاردەخـات لـە بەجێگەیاندنی ئاڵوگۆڕە دواخراوەکان لەگەڵ ئاڵوگۆڕە هەنووکەیەکان — ئەوە مانای وایە مەرجی سەرەکی بۆ ئەوەی دراو وەکوئەرکی ئاڵوگۆڕکردن ببینێت پێویستە بەشێوەیەکی گشتی قەبووڵ بکرێت بۆ دانـەوەی قـەرزەکان و پـاکۆ کردنەکان.

لـە ئـەنجامی ئـەم هـەموو کـار و ئەرکانـە دراو کردارەکـانی قـەرزدان وقـەرزوەرگرتن ئاسـان دەکـات و بانکـەکان و دامـەزراوە داراییـەکانی تـر و تاکەکان **"متمانة"** دەبخشێتە کۆمپانیا و حکومەت و تاکـەکان، بـە تایبـەتی کۆکردنـەوەی پاشـەکەوت بەشـداری لـە کەڵەکـەکردنی (تـراکم) سـەرمایە و فراوانبوونی وەبەرهێنان و بەرهەم فراوان دەکات، بەم جـۆرە گرنگـی ئـەرکی دراو وەك ئامرازێك بۆ دانەوەی دواخراوەکان روون دەبێتەوە، بۆیـە پێویـستە دراو بـەهای تـا رادەیـەك چەسـپاوبێ بـۆ ئـەوەی بتـوانێ لـە دانـەوەی دواخراوەکان لێهاتووبێ — چونکە گۆڕینی بەهای دراو کار دەکاتە سەر لایەنی ئاڵوگۆڕکراوەکـان — کـە لـە ئاکامـدا دەبێتـە مایـەی زەرەرمەنـدی لایـەنێك و سوودمەندبوونی لایەنەکەی دیکە.

## ئەرکە دینامیکیەکانی دراو: Dynamic Function of Money

ئـەو ئەرکانـەن کـە دراو دەتوانێـت پێـی هەڵسێت و کـار بکاتـە سـەر چالاکییە ئابوورییەکان و ئاستەکانی گەشەسەندنی و ڕەنگدانـەوەی بـە سـەر بـەهای دراو و هێـزی شـت پێکڕینـی — وکاریگـەری لـە سـەر تـەرخانکردنی دەرامەتەکان و دابەشکردنی داهات و سامان و هەموو گۆڕاوەکانی تر.

## خەسڵەتەکانی دراو : Money Characteristics

دوای ئەوەی بۆمان ڕوون بۆوە چۆن دراو سەری هەڵدا و گەشەی کرد بۆ ئەوەی مامەڵەی لە ژیانی ڕۆژانەماندا پێ بکەین، هەروەها ئەرکە جۆر بەجۆرەکانی دراومان زانی. دەکرێ ئەم خەسڵەتانەی کە دراوە ناسراوەکان هەیانە دەست نیشان بکەین:

١- هەمیشە داخوازی گشتی لە سەرە، چونکە خەرجکردنی ئاسانە و هەموو کەس ڕازییە مامەڵەی پێ بکات.

٢- ئەم ڕەزامەندییە گشتییەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ئامرازێکی گونجاوە بۆ پیادەکردنی ئەرکە سەرەکییەکان و هۆکارێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردن و پێوەرێکە بۆ بەهاکان.

٣- بەهاکەی بەرزە لەچاو ئەو قەبارە بچووکەی هەیەتی و هەڵگرتنی ئاسانە.

٤- ئامرازێکی گونجاوە بۆ پاشەکەوتکردن دەتوانرێ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەڵبگیرێ بەبێ ئەوەی توشی زیان یاخود لەناوچوون ببێ.

٥- بەش بەش دەکرێت بە بێ ئەوەی هیچ تێچوونێك یان کەمبونەوەیەك لە بەهاکەی یاخود هێزی شت پێ کڕینی ڕووبدات.

٦- پارێزگاریکردنی دراو لەڕێژەی جێگیریەکەی بۆ بەهاو هێزی شت پێ کڕینی وا دەکات زیاتر بەتوانا بێت لە جێبەجێکردنی ئەرکە سەرەکی بۆ دانراوەکانی.

٧- یەکەکانی چەسپاوەو بەهای هەریەك لەو دراوە لەگەڵ بەهای دراوەکانی تری هاوچەشنیدا یەکسانن.

**بیردۆزەکانی بەهای دراو:** بـەهای دراو لـەژێر سـایەی کۆمـەڵێك کۆمـەڵێك قوتابخانــەی ئــابووری شــی کراوەتــەوە هــەر بەتــەنها لــەم بابەتــەیان نەکۆڵیوەتەوە، بەڵکو لەچوارچێوەی بیردۆزە یان کۆمەڵێك را لەژێر نـاوی (بیردۆزی بەها) هاتووە بەشێوەیەکی تر ئەم قوتابخانانە دوور لـە چـەمك و هۆکارە ئابووریەکانی تر لە دراو لێکۆڵینەوەیان ئەنجام نەداوە.

ئەم قوتابخانەش بەسەر ئەمانەی خوارەوە دابەش بوون:

### ١- قوتا بخانەی کلاسیکی:

ئەم قوتابخانەیە بیروڕاکانی لەنێوان سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بـاو بـوون. ئـەم قوتابخانەیـە بـیروڕای وایـە کـە نرخی شمەك بەڕادەی تێچوونەکەی و دەگمەنیەکی دیاری دەکـرێ، واتـا ئـەم دوو رەگـەزە (تێـچوون و دەگمـەنی: الکلفـة والنـدرة) بنـەمای سـەرەکین بـۆ دیـاریکردنی، بــەهاو نرخــی شمــەك، چـونکە تێـچوونەکانی بەرهــەمهێنان لەقۆناغی بەرهەمهێنانی شمەکەکەو دەگمەنیەکەی گوزارشت لە بـڕی خستنە رووی ئەم شمەکە دەکات — وە هـەروەها دراویـش بەهاکـەی لەسـەر هـەردوو بنەمای(تێچوون و دەگمەنی) دیاری دەکرێت.

کاتێك دراوەکان کانزایی بوون ئەوا تێـچوونەکەی بـەگوێرەی تێچوونی دەرهێنـانی ئـەم کانزایـەی کـە دراوەکـەی لـێ دروسـت دەکـرا وە دەگمـەنی کانزاکە لە سروشتدا دیاری دەکرا. ئەگەر جیاوازیەك لە نێـوان دراو و شمەکـە کانی تـر هـەبێ لـە دیـاری کردنـی بەهاکانـدا ئـەوا بەسـتراوتەوە بـە خـوودی دراوەکە لە سروشتدا.

داواکـاری لەسـەر دراو بـۆ خـودی دراوەکـە نییـە، چـونکە راسـتەوخۆ ئارەزووەکـانی مـرۆڤ لەبـەکار بـردن و بەرهـەم هێنـان تێـر ناکـات، بـەڵکو

هۆکارێکە بۆ بەدەست هێنانی شمەك و خزمەتگوزاریەکان. بەڵام سەبارەت بەخستنەڕوودا پێوەرێکی هاوبەش هەیە بۆ دیاریکردنی بەهای دراو و هەروەها بەهای ئەم شمەکانەی خراونەتە ڕوو. ئەم پێوەرەش پەیوەستە بە بڕی خستنەڕووی دراوو بڕی خستنەڕووی شمەك و خزمەتگوزاریەکان، پەیوەندیەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان بەهای دراو و نرخی شمەك و خزمەتگوزاریەکان لە میانەی ئەو بڕە پارەی خراوتە ڕوو– ئەم پەیوەندییە بەستراوەتەوە بە دراوەوە، چونکە پێوەرێکە بۆ بەهاکان کاتێك بەهای یەکەی پێوەریی بۆ بەهاکانی شمەك و خزمەتگوزاریەکان (دراو) کەم دەبنەوە، ئەوا پێویستە بڕی ئەم یەکەیە زیادبکرێت بۆ ئەوەی یەکەکانی پێوەر بپارێزرێن کە تەواو و گونجاوبن لەگەڵ بەهای شمەك و خستنەڕووەکاندا، بە کورتی ئەوە تێڕوانینی کلاسیکیەکانە بۆ بیردۆزی بەها کەپەیوەندی بە بیردۆزەی بەهای دراوەوە هەیە.

## ٢- قوتابخانەی کۆمەڵایەتی (بەهای کار):

ئەم قوتابخانەیە جەخت لەوە دەکاتەوە کە شمەك بۆ تێربوونی پێویستی بەکاربردن و بەرهەمهێنەکان ئاراستە دەکرێت بۆیە دەکرێ جیاوازی لە نێوان دوو جۆرە بەهای شمەك بکەین:

یەکەمیان – بەهای بەکارهێنان.

دووەمیان – بەهای ئاڵوگۆڕکردن.

## بەڵام چ شتێك بەهای شمەك دیاری دەكات؟

بـە پێـی شـیكردنەوەی قوتابخانـەی كۆمەڵایـەتی – بـەهای ئـابووری شمـەكی بەرهـەمهێنراو بـە بـڕی ئـەو كـارە كۆمەڵایەتیـەی كـە پێویـستە بـۆ بەرهەمهێنانی شمەكەكە دیـاری دەكرێـت – بـڕی بـەهای شمـەك كـاتی كـار: (وقت العمل) دیاری دەكات) – هـەر كاتێـك بەرهـەمهێنانی شمـەكێك كـاتێكی زۆری خایانـد ئـەوا بەهاكـەی زۆرتـر دەبێـت و نـاتوانرێ بـەهای ئـەم شمەكـە دیاریبكرێ تەنها لە رێگای بـەراوردكردنی نـەبێت لەگـەڵ شمـەكێكی تـردا لـە رێگەی كرداری ئاڵوگۆڕكردندا.

بەم شێوەیە دەكرێ گوزارشـت لـە بـەهای شمـەك بكرێـت (بـۆ نموونـە ئاسن) بە رێژەی ئاڵوگۆڕكردن بە شمەكێكی تر(بۆ نموونە گەنم) (ا تـەن ئاسن = ٣ تەن گەنم) وە لە بەر ئەوەی ئاڵوگۆڕكردن لە كۆمـەڵگای نوێدا لـەرێگای دراوەوە ئەنجام دەدرێت كۆتایی یە باری سەوداكردن " شت بە شت " هێنـا. دەكرێ نرخی شمەكـەكان بـە دراو دیـاریبكرێ– نـرخ یـان بـەها: بریتییـە لـە گوزارشتی دراو بۆ بەهای شمەكەكە.

سەرچاوەی بـەها بـە پـێ ی بۆچـوونی ئـەم قوتابخانەیـە بـە **" كـار "** دیاری دەكرێت ودەتوانرێت بـەهای شمـەك بـە هـۆی دراوەوە دیـاریبكرێ كـە گوزارشت لە نرخی شمەك دەكات لە بازاردا، بۆیە گـەر دراو لـە شمەكـە جـۆر بەجۆرەكان جیا بكرێتەوە بەهایەكی تایبەت بە خۆی نییە.

كەواتـە بابـەتی بـەها بـەپێ ی بـیروڕای ئـەم قوتابخانەیـە ئـەوە ڕوون دەكاتەوە بیرۆكەكە سـێ ڕەهەنـدی هەیـە پێـی دەڵـێن چـەمكی تێكـەڵاو كـە ئەمانەن:

١- پەیوەستە بە باسکردنی خودی بەهاکە: واتا بەهای دراو تەنها بە بابەتی ئالوگۆڕکردن بەستراوەتەوە. ئەم خەسلەتە تەنها دراو هەیەتی و لە شمەکەکانی تر جیای دەکاتەوە.

٢- بۆ ڕواڵەتی دەرەوەی بەها دەڕوانێت: واتا بە گوزارشتی دراو بەهای یەکەیەك یان شمەکێکە کە نرخێك یان بەهایەك دەنوێنێ.

٣- باس لەسەرچاوەی بەها دەکات: ئەوە ڕوون دەکاتەوە کێ هەیە بەها بۆ شمەکەکان دابنێ؟ دەرکەوت کە کاری مرۆیی بەها دروست دەکات لە شتەکاندا. مەبەستی لە کار ئەو بڕە کارە تێکرایەیە کە لە ڕووی کۆمەلایەتیەوە داواکراون و کە لە بەهای شتەکاندا بەرجەستە بوون کە لە میانەی ژمارەی یەکە کاتەکانی پێویست دا خۆی دەنوێنێت بۆ بەرهەمهێنانی یەك یەکە لە شمەك و خزمەتگوزاییەکان.

## ٣- قوتابخانەی سنوورەکی (سنوورداری):

بۆ ئەوەی بەهای یەکەی دراو بەپێ ی قوتابخانەی سنوورەکی بەرجەستە بێت، ئەوا ئەم قوتابخانەیە بۆ دیاریکردنی بەهای شمەك و خزمەتگوزارییەکان پشت دەبەستێ بە سوودەکەی واتە توانای چەندە لەپڕکردنەوەی پێداویستیەکانی مرۆڤ. هەروەها ئەم بنەمایە دراویش دەگرێتەوە، بەلام نابێ ڕەگەزەکانی تریش لە بیر بکەین کە بریار لەسەر پەیوەست بەسوودی بەرهەم (قەبارەی بەرهەمهێنان)دەدەن یان پێی دەوترێت پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان.

قوتابخانەی سنوورەکی بڕوای وایە کە بەهای یەکەی دراویش بەهەمان شێوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری مەزەندەی کەسایەتیەوە لە بارەی ئەو سوودەی لەوانەیە لەیەکەی دراو بێتە دەست.

ڕوبرتسون یەکێکە لە بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە دەڵێت: ئێمە مەبەستمان لە بەهای دراو بەهای هەر شتێکی تەواو هاوشێوەی دراوەکەیە بۆ نموونە (نان وپۆشاك)، بەڵام ئەوەی لێرەداجیاوازە ئەوەیە ئێمە دەتوانین لە بەهای شمەکەکان بە دراو دیاری بکەین. بەڵام ناتوانین نرخی دراو وەك خودی دراو دیاری بکەین. بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم حاڵەتانە بکەین قوتابخانەی سنوورەکی ڕوویکردە بیرۆکەی سوودی پێکهاتووی دراو.

واتا بەهای دراو بەڕادەی توانا و دەسەڵاتەکەی بۆ پڕکردنەوەی پێویستیە مرۆییەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێوانە دەکرێ. لەمەدا قوتابخانەی سنوورەکی وا دادەنێن کە دراو چەشنی ئۆتۆمبێلێك یا هۆکارێکی گواستنەوەیە بەشداری لە ئاڵوگۆڕکردن دەکات لە نێوان شمەك و خزمەتگوزاییەکان – بەڵام بنەمای پێوانەیی بۆ بەهاکان بەو سوودەی کە لە یەکە دراوەکە بەدەست هاتووە دیاری دەکرێ.

شیکردنەوەی قوتابخانەی سنوورەکی هەوڵدەدات چالاکییە ڕاستەقینەکان و چالاکییە دراوییەکان بکەونە ژێر ڕکێفی هەمان یاسا سنوورداریەکان. کەچی زەحمەتە یاساکانی بەهای تایبەت بە شمەك و خزمەتگوزاریە ئابووریەکان لە سەر بەهای دراو جێبەجێ بکرێن، چونکە لەوانەیە نەتوانرێ دراو (شمەکێك) بێت هەروەکو شمەکە ئابورییەکانی تر. بە واتایەکی وردتر دراو ناتوانرێ بەهای بەکارهێنراوی هەبێ هەروەك لە شمەك و خزمەتگوزاریە ئابووریەکاندا ( بەرهەم هێنراو ) هەیە، هەر چەندە تا ڕادەیەك بەهایەکی ئاڵوگۆڕکردنی گەورە هەیە، بۆیە دەکرێ بەهای ئاڵوگۆڕکردنی دراو بەبەهای بەکارهێنانی دیاری بکرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە نابێ.

## هەڵاوسان : ( Inflation )

دیاردەی هەڵاوسان لەو دیاردانەیە کە زۆرترین پەیوەندی بە دیاردەکانی ئابووری و دراوی ئابووریە هاوچەرخە پێشکەوتووەکان و گەشە کردووەکان هەیە. بە چاوپۆشینی لە پلەی گەشەسەندن و ئاستی پەرەپێدان کە ئەم ئابووریانە هەیانە.

ئەم دیاردەیە دوای جەنگی جیهانی دووەم (١٩٤٥ و دواتر) سەری هەڵداوەو، شێوەو ناوەڕۆکی ئەم دیاردەیە لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا بەتەواوی بەدیارکەوت. هەر چەندە ئەدەبیات و کولتووری ئابووری پڕاوپڕە لە بابەتەکانی گرانی و بەرزبوونەوەی نرخەکان، بە تایبەتی ئەو کێشانەی کە کۆمەڵگای ئەورووپی لە هەر دوو سەدەی شانزدەهەم و حەڤدەهەمدا و دواتریش وڵاتەکانی تر دووچاری بوون.

| |
|---|
| هەڵاوسان:<br>واتا بەرزبوونەوەی زیاد و بەردەوام لە ئاستی گشتی نرخەکان لە ماوەیەکی دیاریکراو کەماوەکەش کورت بێت. |

هەموو بەرزبوونەوەیەك لە نرخەکان بە مانای هەڵاوسان نایەت، بەڵکو هەڵاوسان و بەرزبوونەوەی نرخەکانە.

بۆیە هەڵاوسان ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بەرزبوونەوەی زۆرو لە ئاستی گشتی نرخەکان لە ماوەیەکی دیارکراودا. بەڵام بەرزبوونەوەی ڕێژەیی بۆ هەندێك لە شمەك و خزمەتگوزاریەکان بۆ ماوەیەکی دیارکراو، مەرج نییە حاڵەتی هەڵاوسان بێت یان لەوانەیە هۆکارەکانی ڕوودانی ئەم هۆکارانە نین کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی هەڵاوسان. هەروەك لە وەرزە نەهاتەکانی کشتوکاڵ یان کەمبوونەوە لە بەرهەمهێنان بەبێ ئەوەی هێزی بەرهەمهێنانی

دابـین بکـرێ و یـان گـۆڕانی تـەکنۆلۆژی هونـەری و یـاخود گـۆڕانی بـاج و کۆمەکەکانی حکوومەت وچەندان هۆکاری تر.

هەروەها دەکرێ هەڵاوسان پێناسە بکرێت:

– بڕێکی زۆر لە دراو لە بەرامبەر بڕێکی کەم لە شمەك و خزمەتگوزاریەکان.

– زۆر بوونی ئەو بڕە پارەی کە لە کۆمەڵگە ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ.

– زۆربوونی خواستە لە سەر ئەو شمەك و خزمەتگوزاریانـەی کـە هەیـە و لـە سەر داهاتی ڕاستەقینەش.

## جۆرەکانی هەڵاوسان : Types of Inflation

گرنگترین جۆرەکانی هەڵاوسان ئەمانەن:

### ١ – هەڵاوسانی خشۆك: Creeping Inflation

بەردەوام بەرزبوونەوەی ئاستی گشتی نرخەکانە، بەڵام بەشێوەیەکی لە سەرخۆ، واتە زیادبوونی نرخ لەسەرخۆ وپلە بەپلەیە، ئەوە کەمترین ئاستەکانی هەڵاوسانە، بۆیە لەچاو جۆرەکانی تری هەڵاوسان ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ، وەك بەرزبوونەوەی نرخەکان لە ماوەی دە ساڵ بە رێژەی ١٠٪ واتا تێکڕایی زیادەی ساڵانەی ١ ٪ دەبێت بە مانا ئەم جۆرە هەڵاوسانە ئاماژە بە جووڵەی بەرزبوونەوەیە لە ئاستی گشتی نرخەکاندا و بە ئاستێکی بەردەوام و مامناوەندی کە لە نێوان ١٪ بۆ ٣٪ بێت.

### ٢– هەڵاوسانی کپکراو (هەست پێ نەکراو) :Suppressed Inflation

ئەم جۆرە هەڵاوسانە بە زیاد بوونی نرخەکان بەستراوەتەوە کە دەبوایە ڕوویان بدایە ئەگەر دەست تێوەردانی میریی نەبوایە کە بەهۆی سەپاندنی چاودێری لە سەر نرخەکان و کۆمەك و پشتگیری کردنی نرخەکان بۆ چەند شمەکێك و خزمەتگوزارییەکی سەرەکی و پەیڕەوکردنی سیستەمی کۆبۆنەکانی خۆراك. بۆیە زیاد بوونی نرخەکان هەستی پێ ناکرێت، چونکە حکومەت بە گرتنە بەری ڕێو شوێنی ( دابەشکردنی شمەك، دیاریکردنی نرخەکان) ئەو زیادە ڕاستەقینانەیە کە لە نرخەکان بە شێوەی خەرجی دراو لە بازاڕی ڕەشدا دیار دەکەوێ لای نابات، بۆیە حکومەت ناچار پابەند دەبێت بەم نرخە زیادانە کە لە بەرامبەریدا پێدانی دراو زۆر دەبێ و دەبێتە مایەی زیادبوونی خواست لە سەر شمەك وخزمەتگوزاریە جیاجیاکاندا.

## ٣ – هەڵاوسانی لە رادە بەدەر (سەرکێش ): Hyper Inflation

ئـەم جـۆرە هەڵاوسـانەبە بـەرزترین ئاسـتی زیـاد بـوونی نرخـەکان دادەنرێ، بـە جۆرێـك نرخـەکان بەبـەردەوامی و بـە پلەیـەکی زۆر بـەرز زیـاد دەکـەن، لــە ئەنجامیـشدا دەبێتــە هــۆی هــەرەس هێنــانی سیــستەمی نەختینەیی(دراو)بە هۆی ئەو دارِمانە لە رادە بـەدەرەی کـە لـە بـەهاو هێـزی شـت کـرین روودەدات، وپـارەی نیـشتیمانی هـەموو متمانەیـەك لـە دەسـت دەدا.بۆیە تاکەکان وایان پێ باشە هەر شمەکێك یاخود کەلوپـەلێك هـەڵبگرن لەجیاتی دراو، چونکە گەر بەردەوام نرخـی شمەکـەکانزیاد بکـا ئـەوا دەبێتـە هۆی دابەزینی بەهای پارەی نیشتمانی، و بەردەوام لەدەستدانی هێـزی شـت کرِینی و هەڵگرتنی، پارەی نیشتمانی یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی خۆی وەکو کۆگای بەها(کۆکەرەوەی بەها) لە دەست دەدا، ئەمەش وادەکـات داخواسـت لە سـەر بـەکارهێنانی دراو بـۆ نـزمترین ئاسـت کـەم بێتەوە،لەبەرامبـەر زیـاد بوونی خواست لە سەر شمەك وخزمەتگوزاریە جۆر بەجۆرەکان،کە بـەردەوام نرخیان بەرز دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەم جـۆرە هەڵاوسـانە بـە ترسـناکترین جۆرەکانی نرخ هەڵاوسان دادەنرێ، چونکە هەرِەشە لەسەر قەوارەی ئابووری دراوی دەوڵەت دەکات.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

**پ ١ : ئەم زاراوانەی خوارەوە پێناسە بکە :**

دراو – دراوی پێوانەیی – دراوی متمانەیی – بەهای دراو – **هەڵاوسان**

دراوی ئەلیکترۆنی – دراوی ژمارەیی (دراوی کاش یان دیجیتال)

**پ ٢ : وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە :**

١ – دراو چەند جۆرێکی هەیە، باس لە جۆرەکانی دراو کە.

٢ – باسی ئەرکەکانی دراو بکە.

٣ – خەسڵەتەکانی دراو چین ؟

٤ – بەهای یەکەی دراو ناوی زۆری پێ دەگوترێ دەست نیشانیان بکە.

٥ – سەرچاوەکانی سەرهەڵدانی هەڵاوسان لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو چین ؟

٦ – ئەو لایەنانەی دراوی کاغەز دەردەکەن بیانژمێرە.

٧ – باسی جۆری دراو بە پێی پەیوەندی لە نێوان بەهای دراو وەك دراو و بەهایەکەی وەك شمەك بکە.

**پ ٣ – ئایا ئەم ڕستانەی خوارەوە ڕاستن ( ✓ ) یا چەوتن ( X ) :**

١ – دراو وەك خودی خۆی خواستی لەسەرنیە، بەڵکو بە مەبەستی بەکارهێنانی بۆ بەدەستهێنانی شمەك و خزمەتگوزارییە.

٢ – مەرج بۆ توانستی دراو تاوەکو ببێتە ناوەندێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن ئەوەیە کە بە گشتی ڕەزامەندی وەربگرێت بۆ دانی قەرز و پاکانەکردن.

٣ – پەیوەندییەکی پێچەوانە لە نێوان بەهای دراو و نرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکان لە میانەی قەبارەی دراوی خستنەڕوودا هەیە.

٤ – سنووردارییەکان بڕوایان وایەکە دراو وەك ئامێرێکە گواستنەوەیە وبەشداری دەکات لە ئاڵوگۆڕکردنی شمەك و خزمەتگوزارییەکان.

## سەرچاوەکانی بەشی چوارەم


١– د. احمد حسين علي الهيتي، اقتصاديات النقود و المصارف، جامعة الموصل، دار ابن الاثير للطباعة والنشر، الموصل، ٢٠٠٥.

٢– جمال خريس و ايمن ابو خضير و عماد خصاونة، النقود و البنوك، الطبعة الاولى، دار المسيرة للنشر و التوزيع والطباعة، عمان، ٢٠٠٢.

٣– د. عوض فاضل اسماعيل الدليمي، النقود والبنوك، جامعة بغداد، مطابع دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٠.

٤– د. محمود يونس و د. عبدالنعيم مبارك، اقتصاديات النقود والصيرفة، مؤسسة شباب الجامعة، الاسكندرية، ١٩٨٢.

٥– د. ناظم محمد نوري الشمري، النقود والمصارف، جامعة الموصل، مديرية دار الكتاب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٦– د. صبحي تادرس قريصة، النقود و البنوك، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٨٨.

٧– د. عبدالمنعم السيد علي، اقتصادات النقود والمصارف، الجزء الاول، الطبعة الاولى، الجامعة المستنصرية، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.

٨– د. محمد احمد الرزاز، محاضرات في النقود و البنوك، دار الحمامي للطباعة، القاهرة، ١٩٧٤.

٩– د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٠–د. اكرم حداد و مشهور هذلول، النقود و المصارف : مدخل تحليلي و نظري، دار وائل للنشر، عمان، ٢٠٠٥.

١١–١١ – د. احمد حسين الرفاعي و د. خالد واصف الوزني، مبادئ الاقتصاد الكلي بين النظرية والتطبيق، الطبعة الثانية، وائل للطباعة و النشر، عمان، ١٩٩٧.

12-M. L. Burstein، " Modren Monetary Theory "، Mac Millan Press Inc.، London، 1988.

13-Klaus F. Zimmermann، " Fronteers In Economics " Springer، 2002.

14-Richard Coughlan،" The Theory Of Money and Finance " MacMillan Press Inc.، London، 1986.

15-Paul Hallwood and Ronald MacDonald،" International Money: Theory، Evidence and Institution "، Basil Blackwell Inc.، 1988.

# بەشی پێنجەم

## بــانکــەکــان

## BANKS

بانکــەکان ئەو دامەزراوانــەن کــەوا یــەکێك لــە ئەرکەســەرەکیەکانیان متمانەدانە بە ســەوداکەران جـا کەســەکان بـن یـان پڕۆژەکـان. و دەزگایەکـە مامەڵە بە قەرزو بازرگانی پێ دەکات.

بانکەکان لەسەر پاشماوەی کۆمەڵێك لە داب و نـەریتی ســەردەمەکانی پێشوو دامەزراون. کە سەرەتا کاری متمانەیی بەشێوەیەکی سادە لـە ڕێگـای گەورە بازرگانەکان و زێڕینگران و سووخۆرەکان (المـرابین) بەڕێوەدەچـوون. یەکەمین کار کە بانقەکان پێی هەڵسان بریتی بوو لە قــەبوولکردنی سـپاردەی ســەوداکەران لەســەر بنــەمای قــەرز وەرگــرتن و بەڵێنــدان بــۆ پێدانــەوەیان لەکاتێکی دواتردا، ئینجا قۆناغێکی دیکە بەرەو پێشەوە چوو کاتێ جـەماوەر دەستی کرد بە وەرگرتنی قەرز لەو سپاردانە. بەمەش هەردوو کرداری " قەرز وەرگرتن و قەرزپێدانی بەیەکەوە کۆکردەوە " ئـەوەش سـەرەتایەك بـوو بـۆ ڕێکخستنی متمانەیی و گەشەپێدانی بۆ ئەوەی باشترین شـێوە لـەخۆ بگرێـت کەشــێوەی دروســتکردنی ســپاردەکان و ســپاردە پێکهاتووەکــان (الودائــع والودائع المشتقة).

بە تێپەربوونی کات سیستەمی بانکی گەشەی سەندو ئەرکەکانی هەمـە جـۆر بـوون. شـان بـە شـانی بانکـە بازرگانیـەکان (بـەم پێیـەی کـەوا یەکـەم دامــەزراو بــوون بــۆ پــارەدارکردنی بازرگــانی دروســت بــوو بــوون) بــانکی

دیکەدامـەزران کـە هـەر یەکـەیان بـەجۆرێکی دیـاریکراو متمانـەی پێشکەش دەکرد. ئەم بانکانە دوو ئەرکی سەرەکیان پیادە دەکرد:

– یەکـەمیان" ئـەرکی نەختینـەیی (Money Function) بـوو کـە خـۆی لـە قـەبوولکردنی سـپاردەکان و پێـدانی قـەرز و دروسـتکردنی سـپاردەکان و دەرکردنی دراوی کاغەزدا دەنواند.

– دووەمیان " ئەرکی پارەدارکردن Financing Function " بووکە بانکـەکان لە ڕێگای پێدانی پـارە بـەو پرۆژانـەی کـە پێویـستیان پـێ هەیـە، جـا چ بـە مەبەستی دامەزراندنیان بێت یان بۆ چوونە ناو قۆنـاغی بەرهـەمهێنان یـاخود بۆ پەرەپێدانی بەرهەمەکانیان بێت.

دامەزرانــدن و گەشــەی دەزگــا بانکییــەکان پەیوەســت بــوو بــە گەشەسەندنی سیستەمی سەرمایەداری – سەرهەڵدانی زێڕنگـران لـە کۆتـایی سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەوروپا (هەر وەك لە سەرەوەدا ئاماژەی پێکـراوە) سـەرەتای ڕاسـتەقینەیە بـۆ چـالاکی بانکـە متمـانی و وەبەرهێنـەکان. ئـەم چالاکیە قۆناغ بە قۆناغ شان بە شانی ئەو گەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتیـە بەرفراوانەی کە سیـستەمە ئابووریـەکان لـەو ماوەیـەدا بـە خۆیـان دیـووە تـا وەکو ئەمڕۆ.

ئـەو چـالاکییە متمانەییـە کـە زێڕنگرەکـان پیادەیـان دەکـرد بنـەمای بنـچینەیی سـەرهەڵدانی بانکـە بازرگانیـەکان بـوو و دواتـر بـووە بنـچینەی سەرهەڵدانی بانکە ناوەندییـەکان کـە ئـەرکی ڕێکخـستن و چـاودێری چـالاکی بـانکی و متمانـەیی لەئەسـتۆ گرتبـووە – سـەرەڕای قـۆرخکردنی دەرکردنـی دراوو ئەرکەکانی دیکە کە لەلایەن حکومەتەوە پێی سپێردرا.

## جۆرەکانی بانك: Types of Banks

هەروەك لە سەرەوەوە دیاری کرا جۆرەها بانکی جیاجیا هەیەو هەر یەکەشیان کار و ئەرکێکی دیاریکراو پیادە دەکات و بەمشێوەی خوارەوە:

### یەکەم - بانکە بازرگانییەکان: Trade Banks

ئەو دامەزراوانەن کە سپاردەکان لە تاکەکان و دەستەکان وەردەگرن بۆ خواستی ژێر دەست و پاشینە ئینجا ئەم سپاردانە بۆ پێدانی قەرزو پێشینەی قەرز (سلفە) بەکار دەهێنرێ.

واتا ئەم دامەزراوانە مامەڵە بە متمانەیی ماوەی کورت خایەن دەکەن بە مەبەستی بەدی هێنانی دوو ئامانج:

١. دابینکردنی پاشەکەوتە ناوخۆییەکان بۆ یەکە ئابووریەکان، تاکەکان بن یان کۆمپانیاکان ویان دامەزراوو و بریکارەکان.

٢. پێشکەشکردنی قەرز و ئاسانکاریەکانی تر بۆ یەکە ئابووریەکان.

بانکی بازرگانی متمانە دروست بکات ئەوا پشت بە چوار پێوەر دەبەستێت ئەوانیش:

١ – کەسایەتی قەرز وەرگر.

٢ – سەرمایەی قەرز وەرگر.

٣ – توانای دارایی قەرز وەرگر.

٤ – دەستەبەر (ضمان).

## ئەرکەکانی بانکی بازرگانی:

دەتوانین ئەرکەکانی بانکی بازرگانی بەم شێوەیەی خوارەوە بخەینە ڕوو:

١- وەرگرتنی سپاردەکان.

٢- قەرز پێدانی دەرامەت وئاسانکارییەکانی متمانەیی کە لە سەرەتادا تەنها داشکانی کۆمپیالەی بازرگانی بوو وەرگرتنی لە کاتی شایستەبووندا.

٣- رەخساندنی دراوی بانکی بۆ بەشداریکردن لە زیادبوونی چالاکییەکانی ئابووری.

## کۆمپیالە:

بریتییە لە کاغەزێك کە خاوەن قەرز دەری دەکات تێیدا فەرمان بەسەر قەرزارەکەیدا دەدات کە پارەیەکی نەختینەیی دیاریکراو کەبەرواری رۆژی دیاریکراو لەسەری نوسراوە بدات بە هەڵگری کاغەزە(کۆمپیالەکە) واتە (کۆمپیالە کاغەزێکی بازرگانییە).

## کۆمپیالە داشکاندن:

کاتێك بانقەکە(کومپیالە)ی بۆ دەبەن وەری دەگرێت و قبوڵی دەکات پێش تەواو بوونی ماوەی قەرزەکە لەجیاتی قەرزارەکە بەهای کۆمپیالەکە دەداتەوە، بەڵام دەستخۆشانە (برێ پارە) بۆخۆی لێ ی دادەشکێنێ.

## پشك (سهم):

بریتییە لە کاغەزێ: کەتێیدا بەشی سەرمایەی کەسێك لەپڕۆژەیەکدا دیاری دەکات و هەموو کەسێك بەپێی ئەو(پشکە)ی کە هەیەتی لە پڕۆژەکەدا (قازانج) و (زەرەر) ی بەردەکەوێت و (پشك) لەبازاڕی ماڵ و دارایدا کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرێ خاوەندارییەتی لەکەسێکەوە دەگوازێتەوە بۆ کەسێکی

تر))، نموونـه ئەگـەر قـەبارەی سـەرمایەی كۆمپانیـای (تۆیۆتـا) پێـك هـاتبێ لە(١٠٠ پشك) و كەسێك (٢پشك) بكڕێت لـەكۆمپانیای(تۆیۆتـا) بـە (٤٠٠٠٠$) ئـــەوا ئـــەم كەســـە بـــەپێی ئـــەو پـــشكەی كـــە هەیـــەتی لەســـەرمایەی كۆمپانیاكـە(قـازانج) و (زەرەر)ی بەبـەر دەكـەوێت و ئـەم كەسـە دەتوانێـت (پشك)ی خۆی بفرۆشێت لە بازاڕی ماڵ و دارایـی بـەو نرخـەی كـە كڕیویـەتی یان زیاتر یان كەمتر.

**قەباڵە( سەنەد ):**

((بریتییە لـە كاغـەزێك كـە قـەرز وەرگـر دەری دەكـات جـا قەرزارەكـە(بانـك بازرگـانی) بێـت یـان تاكەكـەی خـەڵك یـان حكومـەت بێـت كـە لـەم كاغـەزە بازرگانییە ناوی كەسەكەو بڕی قەرزەكەو نرخـی سـوودەكەو مـاوەی دانـەوەی قەرزەكە تێیدا تۆماركراوە ئەم كاغـەزە كـڕین و فرۆشـتنی پێوەدەكرێـت واتـا خاوەنداریەتی لە كەسێكەوە دەگوازرێتەوە بۆ كەسێكی تر))

**دروستكردنی سپاردەكان:**

بیرۆكەی دراوە سپاردەكان: بانكە بازرگانییەكان متمانەی خۆیان بە دوو ڕێگا پەیدا دەكەن:

١- گەر بێتو بانكەكە بڕی قەرز بە یەكجار یان چەند جارێك بە شێوەی دراوی یاسایی لەو دراوەی هەیەتی بداتـە قـەرز وەرگر،لـەم حاڵەتـەدا ئـەوەی كـە ڕوودەدات تەنها كرداری گواستنەوەی بـڕی ئـەم دراوەیـە لـە بانكـەوە بـۆ دەستی قەرزوەرگران بەبێ ئـەوەی هـیچ گۆڕانكاریـەك لـە سـەر كـۆی بـڕی دراووە خستنەڕووەكەدا ڕوویدات.

٢- بانك ئەو مافە بە قەرز وەرگر بدات كەوا ئەو بڕە قەرزەی لـە سـەری ڕێـك كەوتوون بە هۆی چەكەوە (Cheques) یـان ڕەوانـەكراوەكان (Transfers )

ئەو برە بكێشیتەوە. لەم حاڵەتەدا قەرزوەرگر بۆی هەیە ئەم برە پارەیە لە ڕێگای چەكەكانەوە بۆ دانەوەی بەهای شمەك و خزمەتگوزاریەكان بەكاربهێنێت هەر وەك دراووی یاسایی بەكارهێنابێت — بەم ڕێگایە هەندێك لە پێداوەكان بێ بەكارهێنانی دراوی یاسایی ئەنجام دراوە، ئەوەش بە بەكارهێنانی دراوی تر كە بانكەكە دروستی كردوون واتا دراوی سپاردەكان ( Money Deposits ) كە بانك بە بەربەستەژمێرییەكانی لە تۆمارەكانی دروستی كردون لەم حالەتەدا برێكی دیكە لەم دراوە لە جۆرێكی تر خرانە سەر بڕی دراوە یاساییەكە، ئەمەشە پێی دەڵێن "دراوی سپاردن" كە بانك دروستی كردوون لە ئاكامدا دەبێتە مایەی زیاد بوونی بڕی كۆكراوی دراوە خراوەڕووەكە.

## دووەم - بانكە ناوەندییەكان : Central Banks

بانكی ناوەندی ئەو بانكەیە كە بە لوتكەی سیستەمی بانكی دادەنرێ چ لە بارەی دەرچوونی دراو بێت یان لە بارەی كردارە بانكیەكانەوە چاودێری لە سەریاندا. وەهەر وەها بریتییە لە دامەزراوێكی گشتی كە زیاتر گرنگی بە مامەڵەكردن دەدات لە گەڵ دامەزراوەكان نەك لە گەڵ خەڵكدا. ئەوەی باوە هەر وڵاتێك بانكێكی ناوەندی هەیە جگە لە ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا كە زیاتر لە دوانزە بانكی تایبەت بە دەركردنی دراوی هەیە و لەژێر چاودێریكردنی ئەنجومەنێكی فیدراڵیدایە، بانكی ناوەندی دامەزراوێكە مەبەستی سەرەكی قازانجكردن نییە.

زۆرجار دەبینین بانكی ناوەندی وەك بانكێكی بازرگانی گرنگ دادەمەزرێت كە حكومەت دەسەڵاتی دەرچوونی دراوی پێ دەدات هەر وەك لە ساڵی ١٨١٤ ز لە هۆڵەندا پیادەكرا لە ولە ئینگلترا لە ساڵی ١٨٤٤ ز

وفەرەنسا لە سالّی ١٨٤٨ ز وئەلّەمانیا لە سالّی ١٨٧٥ ز وە ئەمەریکا لە سالّی ١٩١٤ز. و لە عێراق لە سالّی ١٩٤٧ز. هەبوو.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی بانکی ناوەندی دەلّێن: بریتییە لە کۆمەلّێك دامەزراوەی دراوی و پێکهاتەکانی کە مەبەستیان ئەنجامدانی کۆمەلّێك ئامانج و پیادەکردنی کۆمەلێك ئەرکە بۆ بەڕێوەبردن و نەخشەدانانی سیاسەتی نەختینەیی.

## سیٚ بیروڕای تایبەت بە دیاریکردنی چەمکی بانکی ناوەندی هەیە :

١. کۆمەلّەی یەکەم بڕوای وایە کە بانکی ناوەندی ئەو دامەزراوەیە کە چاودێری بانکەکانی تر دەکا بە شێوەیەك یارمەتی جێبەجیٚ کردنی سیاسەتی نەختینەیی دەدات.

٢. کۆمەلّەی دووەم بڕوایان وایە کە بانکی ناوەندی ئەو دامەزراوەیە کە هەولّی پاراستنی جێگیربوونی ڕێسای دراو دەدات بەتایبەتی لە چاودێری بەکارهێنانی دراوەکان.

٣. کۆمەلّەی سێیەم بڕوایان وایە کە بانکی ناوەندی ئەو دامەزراوەیە کە ڕێگەی پیٚ دەدرێت ئەرکی قەبارەی دراو ومتمانەی ئابووری ڕێکبخات.

بانکە ناوەندییەکان سیاسەتەکانی خۆیان لە میانەی کۆمەلّێك ئامرازی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە (**الادوات الكمية والنوعية** ) پەیڕەو دەکەن:

أ- ئامرازە چەندایەتیەکان پەیوەستن بە یەدەگی یاسایی، و نرخی داشکاندن، و کردارەکانی بازاڕەکراوەکان و کردارەکانی پاکۆکاری.

ب- ئامرازەکانی چۆنایەتی: ئەم ئامرازانەن کەوا پەیوەستن بە سەرنج ڕاکێشان و ئاراستەکردنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و دیاریکردنی ریزەکانی متمانەو ڕێوشوێنی قەرزدانەوە و سووەکان.

## ئەرکی بانکە ناوەندییەکان:

بانکە ناوەندییەکان سێ خەسڵەتیان هەیە کەلە هەمان کاتدا ئەم خەسڵەتانە ئەرکی سەرەکی ئەم بانکانەن:

### ١-بانکی ناوەندی بانکی دەرکردنی دراوە:

بانکی ناوەندی لە زۆربەی وڵاتاندا بە بەپێی یاسا تاکە قۆرخکەری دەرکردنی دراوە، بەم پێیە کە پایەیەکی ئەوتۆی هەیە دەتوانێ چاودێرێکی کاریگەر بێ لەسەر پارەدا کەلە ئاڵوگۆڕکردندان لە نێوان خەڵکدا. بەپێی پێویست بڕیار لەسەر بڕی ئەو پارەیە دەدا بۆ مەبەستی مامەڵەکردن و یەدەگ و ئاڵوگۆڕکردن بەکار دێت. لە سەر بانکی ناوەندی پێویستە بڕی ئەو پارەیە دابین بکات بۆ پارەدارکردنی چالاکییە ئابوورییەکان پێویستن بەرێژەیەك بێ نەبێتە هۆی هەڵاوسانی نەختینەیی.

### ٢- بانکی ناوەندی بانکی بەنکەکانە:

بەبانکی ناوەندی دەگوترێت بانکی بانکان، چونکە تەنها مامەڵە لەگەڵ بانکەکان دەکات بەبێ تاکەکان، لە چوارچێوەی ئەم ئەرکەوە بانکی ناوەندی دوا پەناگەیە کە بانکەکان هەر کاتێ پێویست بوو پەنای بۆ دەبەن، چونکە بانکەکان سپاردەی خۆیان لەم بانکە هەڵدەگرن وەك (یەدەگی یاسایی) هەروەها هەر پێویستی بە دەرامەت بوو ئەوا هەڵدەستێت بە دووبارە داشکاندنی ئەو کاغەزە بازرگانیانەی کە بانکەکان هەیانە، و هەروەها هەڵدەستێ بە کرداری پاکۆکردنی حسابی بەنکەکان بەمەبەستی راستکردنەوەی حسابەکان، ئەمەش لە ئەنجامی مامەڵەکردن لە نێوان ئەو بانکانەدا هەیە، بەم جۆرە بانکی ناوەندی چاودێری بانکە بازرگانیەکان دەکات.

دەتوانیت کۆنترۆڵی یەدەگی دراو بکات و دوایش لەسەر توانای بە قەرزدان و دروستکردنی دراو بزانێ، ئەوەش لە میانەی سێ ئامرازدا:

١- گۆڕانی رێژەی یەدەگی یاسایی.

٢- کردارەکانی بازاڕی کراوە.

٣ - گۆڕانی نرخ داشکاندن.

## ٣- بانکی ناوەندی بانکی دەوڵەتە:

بانکی ناوەندی وەك بریکاری دارایی حکومەت کار دەکات، چونکە سپاردەکانی حکومەت دەپارێزێت و لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر لە ناو وڵات و دەرەوەدا دەیانگوازێتەوە، و هەروەها کڕین و فرۆشتنی کاغەزە داراییەکان بۆ حسابی حکوومەت و یارمەتی دەدات بۆ دەرکردن و بازاڕگیری پسوولەی حکوومەت، وهەروەها پێدانی سوودو بەدەستهاتووەکان، و لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە بانك هەڵدەستێ بە نەهێشتنی ئەو کاریگەرییە زیانبەخشانەی کە لەوانەیە کار بکاتە سەر باری دارایی حکومەت لەئابووری نیشتیمانیدا، کە لەئەنجامی خەرجی حکومەت و باجی زۆرەوە رووبدات، هەروەها ئەو قەرزە گەورانەی کە دەیکات.

## سێیەم- بانکە تایبەتمەندەکان:

یەکێك لە چالاکییە هەرە گرنگەکانی بانکە تایبەتمەندەکان بریتییە لە پارەدارکردنی کەرتە جۆربەجۆرەکانی ئابووری. یەکەم بانکی ئیراقی تایبەتمەند بریتی بوو لە بانکی کشتوکاڵی — پیشەسازی کەلە ساڵی ١٩٣٥ دامەزرا، بەڵام زیادبوونی چالاکییە بانکیەکان و فراوانبوونی کردارە

پارەدارکردنی کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازییەکان وایکرد حکومەت ئەم بانکە دابەش بکات. بۆیەکەمیان بانکی کشتوکاڵی و دووەمیان بانکی پیشەسازی، ئەو بانکانە بەهۆی پێشکەشکردنی قەرزو ئاسانکارییەکان دەتوانێ کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر چالاکییە ئابورییەکان هەبێ.

**بانکە تایبەتمەندەکانی عێراق ئەمانەی خوارەوەن:**

### ١- بانکی کشتوکاڵی:

ئەم بانکە لە ١٩٤٦/٤/١ لە بانکی کشتوکاڵی و پیشەسازی جیابۆوەو بووە بانکێکی سەربەخۆ، چالاکی پارەدارکردنی کەرتی کشتوکاڵی لەئەستۆ گرت، ئەویش لەرێگەی پێدانی قەرزو پێشینەو، یارمەتیدانی کۆمەڵە هەرەوەزیە کشتوکاڵیەکان بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی ولەسەر ئاستی عێراق چەند لقێکی هەیە، بەڵام لەمساڵانەی دواییدا رۆڵی سنوردارکراوە، ئەوانیش پەیوەندیان بەرەوشی گشتی عێراقەوە هەیە.

### ٢- بانکی پیشەسازی:

ئەم بانکە لە ساڵی ١٩٤٦ دوای جیابوونەوەی لە بانکی کشتوکاڵی و پیشەسازی دامەزرا، مەبەستیش لە دامەزراندنی ئەم بانکە گەشەدان بوو بە کەرتی پیشەسازی عێراقی ئەویش لەرێگەی پێشکەشکردنی قەرزی مامناوەندو قەرزی درێژ خایەن لەپێناو دامەزراندن و فراوانکردنی پرۆژە پیشەسازییەکان و، ناوەندێك بێت بۆ فرۆشتنی بەرووبوومەکان لەناوەوەو دەرەوە. هەروەها وەرگرتنی سپاردەو متمانەو و کردنەوەی حساباتی بەگەڕ بۆ سەوداکەران و خاوەن پرۆژە پیشەسازیەکان و هەروەها لە زۆربەی پارێزگاکانی عیڕاق لقی هەیە.

## ٣ - بانکی خانووبەرە:

ئەم بانکە لەنیوەی سەدەی بیستەم وەك پێویستییەك سەری هەڵدا ئەویش بەهۆی بەرزبوونەوەی کرێی خانوو و کەمی خانووبەرە لەچاو ئەو خواستە زۆرەی لەسەر نیشتەجێ بوون هەبوو، سەرەڕای ئەو نرخە سوووەی کە بانك لەسەر سەرمایە بەقەرز دراوەکەی دادەنێت و زۆری بارمتەکان بە نرخێکی بەرز لە سوودخۆرەکان، بۆیە داواکرا ئەم بانکە دابمەزرێ ئەرکی بریتی بوو لە قەرز پێدان بە عێراقیەکان بەم برە پارەیە کە جێی دڵنیایی بێت بۆ موڵکایەتی یان بەمافە جێگیرەکانی تر.

## چوارەم -متمانە Credit

پێشتر ئەوەمان روون کردەوە کە چۆن دراو سەری هەڵداوەو ئەم ئەرکانەش چین پیادەیان دەکات، بۆ نموونە کە ئامرازێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردن و پێوەرێکە بۆ بەهاکان و ئامرازێکە بۆ پاشەکەوتکردن و گێڕانەوەی دواخراوەکان مەرجێکی گرنگ و سەرەکی بوو بۆ سەرهەڵدانی متمانەکردن بە دەزگا زۆرو جۆربەجۆرەکانی، ئەرك و دامەزراوە متمانەکیەکان لەگەڵ ئەو قۆناغە مێژوویيە یەك لە دوای یەکەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوە گەشەیان کردووە. متمانەکردن بوو بە رەگەزێکی سەرەکی لە رەگەزەکانی پارەدارکردنە پێویستیەکان بۆ دامەزراندنو گەشەسەندنی پرۆژە جیاجیاکان.

## پێناسەی متمانەکردن:

وازهێنان یان دەستبەردانە لە داراییەکی ئێستا بۆ دارایەکی ئایندەو بنەماکەشی متمانە بێت، بەواتایەکی ترمتمانەکردن (بریتییە لە گۆڕینەوەی بەهایەکی هەنووکەیی بە بەهایەکی دواخستراو (داهاتوو)).

بۆ نموونە خاوەن قەرز کاتێ بڕێ پارە بە قەرز دەداتە قەرزار ئەوا بەهایەکی هەنووکەیی دەگۆڕێتەوە بەئومێدی ئەوەی کاتێ لەدوارۆژدا بەهای دواخراوی قەرزەکە لەکات و ساتی خۆی وەربگرێتەوە کەلەسەری ڕێك کەوتوون. ئەم چەمکە دەکرێ گوزارشت لە متمانەکردن بێ و، لەلایەکی تریش گوزارشت بێ لەچەمکی (قەرز)، چونکە هەردوو چەمکەکە پەیمان بەدانەوەی لە ئایندەدا، بەڵام لەسەر ئاستی چالاکی ئابووریدا مەبەست لە متمانەکردن: کۆمەککردن و دەستەبەرکردنی ئەو هۆکارانەیە کە لەبواری چالاکییە ئابوورییە جۆربەجۆرەکان پێویستی بە دراوی هەنووکەیی یاخود ئەو شتانەی لەجیاتی بۆ ئاڵوگۆڕکردن بەکار دێ.

کردارەکانی متمانەکردن لە ڕێگای یاسا جیاجیاکاندا پیادە دەکرێت، وەك قەرزو داشکاندن و پێشینە و فرۆشتنی دواخراو و کرێ — و گرنگترین شمەك کە بابەتی متمانەپێکردن بێت دراوە، چونکە ڕێگە بە تاکەکان دەدات بۆ بەدەستهێنانی گشت شمەك و خزمەتگوزاریەکانی تر. ئەم شێوە یاساییەی کە متمانەکردن بەزۆر جار وەریدەگرێت بریتییە لە (قەرزی دراو) و بنەمای سەرەکی متمانەکردن بوونی متمانەیە لە نێوان قەرزدەرو قەرزوەرگر واتا متمانەکردن بە توانستی قەرزوەرگر لە دانی سوودەکەو دانەوەی قەرزەکە لەکات و ساتی خۆیدا لە متمانە پێکردندا پێویستە ماوەیەك لە نێوان پێدان و وەرگرتنەوە واتا قەرزو دانەوەیدا هەبێت.

ئامرازەکانی متمانەکردن ئەمانەن:

١– کاغەزە بازرگانیەکان وەکو کۆمپیالەو چەك و قەباڵەی ڕێپێدراو – بریتییە لەو کاغەزانەی کە دەتوانرێ بگۆڕدرێتەوە کە بۆ کردارەکانی متمانـەی کـورت خایەن بەکاردەهێندرێت.

٢– کاغەزەکانی بنکنۆت

٣– کاغەزە داراییەکان – پشك – قەباڵەکان

## جۆرەکانی متمانە بانکییەکان:

مەبەست لە متمانـەو ڕۆڵـی لـە ژیـانی ئابووریـدا بـەگوێرەی سروشـت و فەلسەفەی سیستەمی ئابووری کە لـە کۆمـەڵگادا هەیـە دەگۆڕێـت، هـەروەها ئاستی گەشەسـەندن و پەرەپێـدانی ئـابووری، بۆیـە جۆرەکـانی متمانـەکردن بـەپێی مەبەسـت و ئەرکـە داواکراوەکـەی متمانـە پێکـردن جیـاوازن و ئـەم پۆلینکردنــە هەرچــۆنێك بــە چ شــێوازێك دابەشــکرابن ئــەوا نــاکرێ لێــك جیابکرێنەوە، وا تێبینی دەکرێ کە جۆرە تێکـەڵکردنێك لـەنێوان ئـەم جـۆرە متمانانەدا هەبێت. وا لەخوارەوە جۆرەکـانی متمانـەکردن بـەپێی مەبەسـت و ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دەدات پۆلێن کراوە.

## یەکەم - متمانەکردن بە پێی چالاکی ئابووری:

ئەم جۆرە پۆلێن کردنە ئەمانە لەخۆ دەگرێت:

### ١- متمانەکردنی بازرگانی:

مەبەست لەم متمانەکردنە ئەوەیە کە بە شێوەی قەرز و ئاسانکاری بانکی دەدرێنە مامەڵەکارەکان بۆ ئەنجامدانی کردارەکانی کڕین و فرۆشتن و بازاڕگیری و ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی ناوەخۆ و دەرەکی جا حکوومی بێت یان پرۆژەکان یان تاکەکان، ئەمجۆرە متمانەکردنە کورت خایەنن.

### ٢- متمانەکردنی بەکاربردن:

ئەم متمانەیە کە تاکەکان بۆ پارەدارکردنی خەرجیەکانی بەکاربردن دەستیان دەکەوێ، بە تایبەتی بۆ پارەدارکردنی شمەکە تەمەن درێژەکان، ئەم جۆرە متمانەکردنە دەدرێنە خاوەن شوێنە بازرگانیەکان و کۆمەڵەکانی پێشینەو بەکاربردن.

### ٣- متمانەکردنی وەبەرهێنان:

مەبەست لەم قەرز و ئاسانکاریانەیە کە دەبەخشرێنە پرۆژە دام و دەزگا بەرهەم هێنەکان بۆ پارەدارکردنیان تا پێداویستییە وەبەرهێنەکانیان پڕبکاتەوە، زۆربەی کاتیش ئەم جۆرە متمانەیە درێژ خایەنن.

## دووەم – متمانەکردن بە پێی ماوە.

سیٚ جۆرە متمانەکردن لەخۆ دەگرێت.

### ١-متمانەکردن بانکی ماوە درێژ:

زۆر جـاران ئـەو پرۆژانـەی پێویـستیان بـە پـارەدارکردنی سـەرمایە چەسپاوەکانیان هەیە، پێویستی بەمجۆرە متمانەکیە دەبێت، بۆیە ماوەکـەی لە(٥) ساڵ زیاترەو دەگاتە(٢٥) ساڵ و (٣٠) ساڵ.

### ٢-متمانەکردنی ماوە مامناوەندی:

ئەم جۆرە متمانە دەدرێنە ئەم پرۆژانەی کـە پێویـستیان بـە سـەرمایە هەیـە بـۆ نوێکردنـەوەو تازەکردنـەوەی ئـەو شـتانەی هەیـەتی، هـەروەها ئەمجۆرە متمانەکردنی بـەکاربرەکیش دەگرێتـەوە کـە پێشکەش بەتاکـەکان دەکرێت بۆ بەدەستهێنانی شمەکە تەمەن درێژەکان، بۆیە ماوەکەی لەساڵێك زیاترە و لە (٥) پێنج ساڵ کەمترە.

### ٣-متمانەکردنی ماوە کورت:

ئەم جـۆرە متمانەیـە تاکـەکان و پرۆژەکـان بـۆ پـارەدارکردنی کـردارە جیاجیاکانیـان بـە دەسـتی دەهێنـت و بـۆ ماوەیـەکی کورتـە کـە لـە سـاڵێك کەمترە (سیٚ، یان شەش یان (٩) نۆ مانگ بگرە تا (١٢) دوانزە مانگ).

## سێیەم – متمانەکردن بە پێی جۆری بیمەکردن ( ضمان ):

مەبەست لەم متمانە پێکردنەیە کـە لایەنـە جیاجیاکـان و بـەهۆی ئـەم بیمەیـەی دەیبەخـشنە ئـەم لایەنـەی متمانەکـەیان پـیٚ دەدات و ئـەم چـەند جۆرەی هەیە:

### ١-متمانەی کەسێتی :

ئەم متمانەیە کە دەدرێنە قەرز وەرگرەکان بەبێ ئەوەی بیمەیەکی (بینراو ) پێشکەش بکەن، تەنها پەیمان دەدەن بۆ دانەوەی قەرزەکە لە کاتی خۆیدا. بانکەکان و لایەنە قەرزدەرەکان پشت بەم پەیمانانە دەبەستن لە میانەی زانینی پلەو شوێنی قەرزدارەکان لە بازاڕدا.

### ٢-متمانەکردنی بینراو :

لەم جۆرە متمانەیەدا قەرزدارەکان بیمەی جۆراوجۆری بینراو پێشکەش دەکەن ئەگەر قەرزدارەکە بۆی نەڕەخسا ئەوەی لە ئەستۆیەتی بداتەوە، ئەوا بانکەکان هەڵوێستی یاسایی دەگرێتەبەر پەنا بۆ ئەو(بیمانە) دەبات کەلەلایەن قەرزدارەکان دراوەن.

## چوارەم – متمانەکردن بە پێی لایەنی داواکار:

ئەم جۆرە متمانەکردنە خۆی لەمانەدا دەنوێنێت.

### ١- متمانەکردنی گشتی.

بەو متمانەیە دەگوترێ کە دەبەخشرێتە دەوڵەت یان حکومەت یاخود دامەزراوە داراییەکانی دەوڵەت.

### ٢- متمانەکردنی تایبەت.

ئەم متمانەیەیە کە دەدرێتە تاکەکان و دەستەکان و کۆمپانیا تایبەتە ناحکومییەکان.

## مەبەستەكانی متمانەكردنی بانكی :

متمانەكردنی بانكی رۆڵێكی گرنگی هەیە لە ژیانی ئابووری هاوچەرخدا ئەم گرنگیەش لە كاتێكدایە كە رۆڵ دەبینێت لەچارەسەركردنی ئاڵوگۆڕكراوەكانی بازرگانی ناوەخۆو دەرەوەدا، پوختەی مەبەستەكانی متمانەكردنی بانكی ئەمانەی خوارەوەن:

### ١- پارەداركردنی بەرهەمهێنان :

دەكرێ بەرهەم هێنەرەكان متمانەكردن بە دەست بهێنن لە رێگای دەركردنی قەباڵە و فرۆشتنی بە پرۆژە و تاكەكان، ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ زیادكردنی قەبارەی پاشكەوتەكان لەلایەن ئەو كڕیارانەی قەباڵەكان دەكرن، بەمەش ئەم دامەزراوە متمانەپێكردنانە رۆڵی نێوەندكار دەبینێت لە نێوان پاشەكەوتكەران و وەبەرهێنەرەكاندا ئەم نێوەندكاریە یارمەتی ئاسانكاری و خێرایی و زێدەبوونی قەبارەی وەبەرهێنان و بەرهەم دەدات لە ئابووریدا، سەرەرای ئەمەش بانكەكان هەڵدەستن بە پێشكەشكردنی قەرزەكان بە شێوەیەكی راستەوخۆ بۆ وەبەرهێنەرەكان لە سپاردە پاشكەوت كراوەكان كە هەیەتی.

### ٢- پارەداركردنی كردنی بەكاربردن :

مەبەست لە ئەركی پارەداركردنی بەكاربردن ئەوەیە كە بەكاربەران شمەكی بەكاربردنی هەنووكەییان بە پارەدانی دواتر دەست دەكەوێ، ئەم جۆرە متمانەیە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی بەكاربەرەكان شمەكی بەكاربردنیان دەستكەوێ، هەروەها لە بەگوڕخستنی لایەنی خواستنەكان لەسەر شمەك وخزمەتگوزاریەكان و دواتر بەشداربوونی لە زیادەكردنی پانتایی بازاڕ و زیادكردنی قەبارەی بەرهەمهێنان و وەبەرهێنان.

## چارەسەری ئاڵوگۆڕەکان:

ئەنجامدانی ئەرکی چارەسەری ئاڵوگۆڕکردن و پاکانەکردن لەلایەن متمانەکردنەوە، گرنگیەکەی لە میانەی پێك هاتووەکانی خستنەرووی دراودا یان بڕی ئامرازەکانی پێدان لە کۆمەڵگادا دەردەکەوێت. وزیادبوونی گرنگی ڕێژەیی بۆ دراوە سپاردەکان لە کۆی پێکهاتووەکانی خستنەڕووی متمانەیە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە چارەسەری ئاڵوگۆڕەکان و راوبۆچوونی قەرزداران لە نێوان لایەنەجیاجیاکاندا هەڵسان بانکەکانی بازرگانی بە دروستکردنی سپاردەکان و بەکارهێنانی ئامرازەکانی تری متمانەکردن لە کاغەزە داراییەکان و کۆمپیاڵەکان یارمەتی زۆری داوە لە ئاسانکاری کرداری ئاڵوگۆڕکردن و فرەوانبوونی قەبارەکەی دا.

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

**پ ١ - ئەم زاراوانە پێناسە بکە:** متمانە – بانکی بازرگانی.

**پ ٢ - وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:**

١. باس لە جۆرەکانی بانك بکە.

٢. ئەو پێوەرانە چین بۆ دروستبوونی متمانە لە بانکی بازرگانی؟

٣. ئەو لایەنانە چین کە بانکی بازرگانی متمانەیان پێدەدا؟

٤. ئەو گریمانە چین کە بانکی بازرگانی پەیڕەو دەکات بۆ دروستکردنی دراوی سپاردن.

٥. باس لەو هۆکارانە بکە کە قەبارەی سپاردە پێکهاتووەکان لە لایەن بانکی بازرگانی دیاری دەکرێ.

٦. چ جۆرە پەیوەندیەك هەیە لە نێوان متمانەی نوێ (سپاردە پێکهاتووەکان) وئامرازە چەندایەتیەکان؟

٧. ئەو کۆمەڵە ڕاوبۆچونانەی سەبارەت بە چەمکی بانکی ناوەندی هەیە دیاری بکە.

٨. باسی ئەرکەکانی بانکی ناوەندی بکە.

٩. جۆرەکانی بانکی پسپۆر ( تایبەتمەند ) چین ؟

١٠. ئامرازەکانی متمانەکردن بژمێرە.

١١. جۆرەکانی متمانەی بانکی چین؟

١٢. باسی متمانەکردن بەپێی چالاکی ئابووری بکە.

١٣. باس لە متمانەکردن بەپێی ماوە و کاتەکان بکە.

١٤. باس لە متمانەکردن بەپێی جۆری بیمەکردن.

١٥. باس لە متمانەکردن بکە بەپێی لایەنی داواکار.

١٦. مەبەستەکانی متمانەی بانکی روون بکەوە.

١٧. باس لە بیرۆکەی دروستکردنی دراوی سپاردە بکە.

**پ ٣ – ئەم ڕستانەی خوارەوە ڕاست ( ✓ ) یا چەوت ( X ):**

١. توانای بانك بۆ دروستکردنی سپاردەکان پشت بە ڕێژەی یەدەگ دەبەستێ.

٢. توانای بانك بۆ لە ( دووهەندکردن : مضاعفة ) سپاردەی دروستکراوەکان پێچەوانەیە لەگەڵ ڕێژەی یەدەگ.

٣.سەرجەم بودجەی بانكی بازرگانی یەكسانە بە هەڵگەڕاوی (مقلوب) ڕێژەی یەدەگ.

٤.بانكە ناوەندییەكان لە میانەی كۆمەڵێك لەئامرازەكانی چەندایەتی وچۆنیایەتیەكاندا پیادەی سیاسەتەكانی دەكات (**الادوات الكمية والنوعية**).

## سەرچاوەكانی بەشی پێنجەم


١. احمد حسين علي الهيتي، اقتصاديات النقود و المصارف، جامعة الموصل، دار ابن الاثير للطباعة والنشر، الموصل، ٢٠٠٥.

٢. جمال خريس و ايمن ابو خضير و عماد خصاونة، النقود و البنوك، الطبعة الاولى، دار المسيرة للنشر و التوزيع والطباعة، عمان، ٢٠٠٢.

٣. د. عوض فاضل اسماعيل الدليمي، النقود والبنوك، جامعة بغداد، مطابع دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٠.

٤. د. محمود يونس و د. عبدالنعيم مبارك، اقتصاديات النقود والصيرفة، مؤسسة شباب الجامعة، الاسكندرية، ١٩٨٢.

٥. د. ناظم محمد نوري الشمري، النقود والمصارف، جامعة الموصل، مديرية دار الكتاب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٦. د. صبحي تادرس قريصة، النقود و البنوك، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٨٨.

٧. د. عبدالمنعم السيد علي، اقتصادات النقود والمصارف، الجزء الاول، الطبعة الاولى، الجامعة المستنصرية، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.

٨. د. محمد احمد الرزاز، محاضرات في النقود و البنوك، دار الحمامي للطباعة، القاهرة، ١٩٧٤.

٩. د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٠. د. اكرم حداد و مشهور هذلول، النقود و المصارف : مدخل تحليلي و نظري، دار وائل للنشر، عمان، ٢٠٠٥.

١١. د. أحمد حسين الرفاعي و د. خالد واصف الوزني، مبادىء الاقتصاد اكعلي بين النظري و التطبيق، الطبعة الثانية، وائل للطباعة و النشر، عمان، ١٩٩٧.

# بەشی شەشەم

## بێکـــاری

## UNEMPLOYMENT

بێکاری وەکو دیاردەیەك لەزۆربەی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی لە کۆنەوە تاکو ئێستا هەبوە وهیچ کۆمەڵگایەکی مرۆڤی کەم تـا زۆر بـێ ئـەم دیاردەیـە نەبووە، لە سیستەمی ئابووری سەردەم وا دەردەکەوێت کە خولی ئابووری چالاک بەبێ دیـاردەی بێکـاری روونـادات، ئـەم حاڵەتـەش بەسـەر ئـابووری نـاوخۆو نەتەوەییـەوە رەنـگ دەداتـەوە، لـە بوارەکـانی گەشـەکردن و بوژانـەوەو پەرەپێدان، کە دەبێتە هۆی دابینکردنی هـەڵی کـاری جۆراوجـۆر و دواتـریش کەمبوونەوەی رێژەی بێکاران لەناو کۆمەڵگادا، بەمجۆرە خولی ئابووری رۆڵـی سەرەکی لە پێکهاتەی ئابووری کۆمەڵگا شارستانیەکان و چـالاکی لـە بـازاڕی کاردا دەبینێت، چونکە بێکاری بەشـێوەیەکی گشتی لـە زۆربـەی کاتـدا بـەو بارگۆڕانە ئابوورییانەی دەوڵەت دەبەسترێتەوە، کاتێك بێکاری دەردەکـەوێت کەرێژەکەی لەگەڵ زیادبوونی رێژەی داکشانەوەی ئـابووری، هاوکـات لەگـەڵ روودانی قەیرانی ئابووری کاتی کە بە هۆکاری ناوخۆیی روودەدات لە ئاکـامی کارو کردەوەی کار یاخود خراپی پەیوەندی نێـوان پرۆگرامـەکانی خوێنـدن و بازاڕی کار یاخود بە هۆی هۆکارو فشاری دەرەکی پەیوەستە بـە سیـستەمی ئابووری نێو دەوڵەتی.

بێکاری بە یەکێك لە دیارترین گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتییـەکانی تـاك و حکومەت دادەنرێ کە کێشەو گرفتی جۆراوجـۆری لێدەکەوێتـەوە، ئەمـەش لـە ئاکـامی ئـەو کاریگەریـە خراپانـەی کـە لەسـەر سیـستەمی ئـابووری

وسیستەمی کۆمەلایەتی دروستی دەکات، بۆیە زۆربەی ولاتان لە جیهانی هاوچەرخ بە بەردەوامی هەولی لێکۆلینەوە لەسەر بێکاری و هۆکار ودەرئەنجامەکانی لەسەر کۆمەلگاکانیان بەدیار دەخەن ولەگەل سەرجەم دانیشتوان بەراورد بکەن، دەیانەوێت ژمارەی بێکاران و کێشەی بێکاری کەلە نەبوونی هەلی کاری گونجاو دەکەوێتەوە چارەسەر بکەن.

بێکاری لە گرنگترین ئەو کێشانەیە کە (سیاسەتمەدارو بریاربەدەستدان)ی سەرقال کردووە و هەولی دانانی پلان و پرۆگرامی داریژراون بۆ کەمکردنەوەی ریژەی بێکاران و کەمکردنەوەیان لەناو کۆمەلگادا، ئەم گرنگیدانە زۆرەش لەو روانگەیەوە دێت کە دیاردەی بێکاری خۆی لە خۆیدا گرنگە و شوێنەواری گەورەی لێدەکەوێتەوە بە تایبەتی لەسەر ژێرخانی کۆمەلایەتی.

بۆ گەیشتن بە چەمکێکی وردی بێکاری پێویستە ئاماژە بەم دەستەواژانەی خوارەوە بکەین، کە یارمەتیمان دەدات بۆ دارشتنەوەی پێناسەیەکی ئاشکراو روونی بێکاری:

## کـــار :Labour

کار لە بنەما گرنگەکانی بەرهەمهێنانە ( رەنگە لە گرنگترینیان بێت ) ئەو داهاتەی لە ئاکامی کارەکەوە دەست دەکەوێت بەشی هەرە زۆری داهاتی نەتەوە پێك دێنێ، کار بریتییە لە خستنەرووی دەرامەتە مرۆییەکان لە هەردوو بواری جەستەیی و (physical) وهزرییەوە ( mental ) ئەم خستنەرووەش پشت بە دوو هۆکار(فاکتەر) دەبەستێت کە ئەمانەن:

١– هێزی کاری کۆمەلایەتی بەردەست، بە واتا دانیشتوان جگە لەو توێژو گروپەی کە کار ناکەن.

٢- ژمارەی کاتژمێرەکانی کاری هەفتانەی دانیشتوان کە ئامادەیە ئەنجامی بدات.

کار بەوە پێناسە دەکرێت، (توانایەکی جەستەیی و بیرییە کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات لە بواری چالاکی ئابووری و پیشەیی لە پێناو بەدەستهێنانی سودێك واتە بە دەستهێنانی پاداشتێك).

کۆمەڵێك هۆکاری جۆراوجۆر هەیە کەکاریگەری لەسەر توانای کاری هەیە لەوانە:

١. تەندروستی گشتی هێزی کار.
٢. رۆشنبیری گشتی و ئەو پێشینە زانیاریەی کە هێزی کار هەیەتی.
٣. ئەو پاداشتەی لەبەرامبەر کار پێشکەش دەکرێ.
٤. مەشقکردن.

## هێزی کار: Manpower

ئەو هێزەیە کە مرۆڤ لەسەر کار هەیەتی، کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك توانای ماددی و هزری تەواو لە لەشی مرۆڤدا ولە کەسایەتی زیندووی، کەلە رێگایەوە دەتوانێت توانای مادی (شمەك و کارگوزاری) بەرهەم بهێنێت.

هێزی کار دامەزرێنەرو جولێنەری هۆیەکانی بەرهەمهێنانە، لەگەڵ پێشکەوتنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان لە مرۆڤدا توانای زیاتر بۆ کارکردن دروست دەبێت، کار توانای مرۆڤە بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەك بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ودابینکردنی پێداویستی ولەئەنجامدا بەشداریکردن لە دروستکردنی خۆشگوزەرانی گشتی بۆ کۆمەڵگە.

بەڵام هێزی کارکەر (labor force) ئـەو کەسـانە دەگرێتـەوە کـەتوانای کارکردنیان هەیە وبە کاری بەرهەمهێنی هەڵدەستن ولـە بـری ئـەم کارەشـیان کرێیەکی نەختینە یان زینـدەماڵی وەردەگـرن، ئـەم حالەتـە ئـەو بێکارانـەش دەگرێتەوە کە (حەزو ئارەزووی کاری یان هەیە، بەڵام دەستیان ناکەوێت).

بە دەستەواژەیەکی تر رێژەیەکی دیـاریکراوە لـە کـۆی دانیـشتوان کـە هێـزی کـاری نـاو کۆمـەڵگا پێـك دەهێـنن (سـەرجەم ئـەو هێزەیـە لـە هـەر قۆناغێکی زەمەنی دەخرێتە روو) واتە ئـەو بەشـەی دانیـشتووانە کـە توانـای وئارەزووی کارکردنیان هەیە.

## کارپێدانی تەواوەتی: Full Employment

ئەو حالەتەیە کە تێیدا ئابووری نەتەوەیی دەگاتە توانای بەگەڕخستنی سەرجەم تاکەکانی هێزی کارکردن کە بەدوای کاردا دەگەڕێن و توانای کاریان هەیە بەو نرخە ئاسـاییە پـەیڕەوکراوە هاوشـان لەگـەڵ کارپێـدانی تـەواوەتی بێکارییەکی لاوەکی پەیدا دەبێت، چونکە کارپێدانی تەواوەتی بە شێوەیەکی کەم لە هەموو سیستەمە ئابووریە جۆر بـە جۆرەکـان بەرچـاو دەکـەوێ، بـەو پێیەی کارپێدانی تەواو بریتییـە: (لـەو ئاسـتەی کـە بـەکارهێنان کۆتـایی بـە بارودۆخی بێکاری زۆرەملی دەهێنێ، ئەم ئاستەش لەیەکەمجاردا وەکو ئـەوە وایـە:(رێژەیـەکی دیـاریکراو لـەکارکردن کـە دەتـوانرێ لەگـەڵ کاتـژمێری کارکردنـەوە ئـەژماربکرێت گـەر زانیـاری تـەواو و تایبـەت بەخـستنە ڕوو و خواستن لە بازاڕی کارکردن هەبوو).

**بێکاری : Unemployment**

دیاردەیەکە لەوەدا دەردەکەوێت ئەو کەسانەی کە لە تەمەنی کارکردندان ناتوانن بەشداری لە چالاکی ئابووری بکەن لە کات و رۆژگارێکی دیاریکراو لە ئاکامی هۆکاری بەدەر لەویست و خواستی ئەوان، گەرچی توانای کارکردن و ویستی بەدەستهێنانی کاریان هەیەو بە بەردەوام بەدوایدا دەگەڕێن.

بەشێوەیەکی گشتی بێکاری نیشانەیەکە بۆ بوونی جیاوازی لە نێوان بڕی خستنەرووی کار وبڕی کاری بەگەڕخراو، لە ناو چالاکییە ئابوورییەکان لە ئاست ڕێژەی کرێ و بارودۆخی ئەوکارەی لە بازاڕدا هەیە و تێکڕای بێکاریش جیاوازە لە نێوان پیشە و چالاکییە ئابوورییە جۆراوجۆرەکان، هەروەها لەنێوان ناوچەی جوگرافی و توێژەکان و تەمەنە جیاوازەکان.

**تێکڕای بێکاریش :** کە بە نیشانەیەکی ئابووری سەرەکی دادەنرێ بۆ توانای ئابووری، ئەو ئابوورییەی کە دووچاری بێکاری بەرزو بەردەوام بووە دووچاری بەفیڕۆچوونی دەرامەتەکانی بەرهەمهێنان دەبێت، ئاستی بەرهەمهێنانیش نزمترە لە ئاستی دەرامەتەکانی بەرهەمهێنان، لەسەر ئەم بنەمایە دانیشتووان بە پێی ئامارەکان دابەش دەبێ بەسەر چوار کۆمەڵە(گروپدا):

١- ئەو کەسانەی کە لە ناو هەندێك جۆری کار لەکاتی ئەنجامدانی سەرژمێری.

٢- ئەو کەسانەی داوای ئیش دەکەن، بەڵام بەدوایدا ناگەڕێن، چونکە وادەزانن کاریان دەست ناکەوێ.

٣–ئەو کەسانەی داوای کار دەکەن و بە دوایدا دەگەڕێن، بەڵام ئەو کارەیان دەست نەکەوتووە کە داوای دەکەن.

٤–ئەو کەسانەی لە دەرەوەی هێزی کارن و داوای کاریش ناکەن.

کاتێکیش بێکاری بەتێکرای بێکاری دەپێورێت، بریتییە لە ژمارەی ئەو کەسانەی کارناکەن لەسەر سەرجەمی هێزی کار وەك بەم شێوەیەی خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

$$\text{ڕێژەی بێکاری} = \frac{\text{ژمارەی بێکاران}}{\text{سەرجەم هێزی کار}} \times ١٠٠$$

## هۆکارەکانی بێکاری: The Causes Of Unemployment

دەتوانین هۆکارەکانی بێکاری بۆ ئەم هۆیانەی خوارەوە بگەڕێنینەوە:

### یەکەم – هۆکارە ناوخۆییەکان:

بێکاری لەئابووری هەر ولاتێك بێت دەکەوێتەژێر کاریگەری ئەم هۆکارانە جا چ لەلایەنی خواستەوە بێت یاخود لە لایەنی خستنە ڕووەوە:

١– بەرزبوونەوەی ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتووان بە تایبەتی لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو.

٢– زیادبوونی دەرچووان لە بواری خوێندن لە سەرجەم پسپۆرایەتییە زانستییەکان.

٣- لێشاوی هاتنی کرێکارانی دەرەکی جا کرێکارانی هاتوو بێ یاخود کرێکارانی کۆچبەر یاخود ئەو کرێکارانەی کە لە ناوخۆدا کۆچ دەکەن لە ئاکامی هۆکاری (ئابووری، سیاسی، کۆمەلایەتی... هتد).

٤- بێ توانای ئابووری ناوخۆ لە پێکهێنانی کەڵەکەبوونی سەرمایەی پێویست بۆ وەبەرهێنان لە پرۆژە ئابووریە جۆراوجۆرەکانی ناوخۆدا، لەسەرجەم بوارەکانی (بونیادنان و فراوانکردن و پێشخستن)

## دووەم : هۆکارە دەرەکییەکانی بێکاری بریتییە لە :

١ - بارودۆخی ئابووری جیهانی کە دووچاری بارگۆڕانی ئابووری ناوبەناو بە تایبەت وەستاوی و داکشانەوەی ئابووری دەبێت، بەتایبەتیش ئابووری وڵاتانی پێشکەوتوو، کە رۆڵ و کاریگەریەکی گەورەی لە سەر ئابووری وڵاتانی تر هەیە).

٢ - کاریگەری رووداو و کارەساتە جیهانییەکان کە لە سەرجەم ئابوورییە جۆربەجۆرەکان روودەدات و دەبێتە هۆی تەنگژەی ئابووری جیهانی و کار لە زیادبوونی رێژەی بێکاری و بەرزبوونەوەی نرخی نەوت و سەرچاوەکانی دیکەی وزە دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی تێچوونی بەرهەم و کەمبوونەوەی بەکارهێنانیان.

## جۆرەکانی بێکاری: Types of Unemployment

بێکاری چەندین جۆر لەخۆ دەگرێت بەهۆی هۆکارەکانییەوە، ئەمەش وا دەکات چەندین رێوشوێنی بۆ رووبەڕووبوونەوەی بگرینەبەر، دەکرێت جیاوازی لە نێوان دوو جۆری سەرەکی بێکاری بکەین، لە ناو هەر یەکێکیشیان چەند جۆرێکی جیاوازی تر هەیە ئەویش:

یەکەم: بێکاری ئاشکرا (دیار) کە دابەش دەبێ بۆ:

(١) بێکاری زۆرەملیّ وەك بێکاری نەگونجان (ڕێك نەکەوتن) و پەیکەربەندی و ناو بەناو و وەرزی.

(٢) بێکاری ئارەزوومەندانە.

دووەم : بێکاری شاراوە (نادیار)

وا لەخوارەوە بە وردی لێیان دەدوێین:

**١- بێکاری زۆرەملیّ:** کە چوار جۆرە:

أ- بێکاری نەگونجان (بەریەك کەوتن):

واتە کەسانێك توانای کارکردنیان هەیە بۆیە بەدوای کارێکی گونجاو یان باشتر دەگەڕێن ئەمەش لەکاتێکدایە کەوا کاری ئەوتۆ هەیە کە لەگەڵ تواناو شارەزایی و تەمەنیان دەگونجێت، کەچی ئەو کارانەیان دەست نەکەوتووە، لەبەر ئەوەی نەیان زانیوە کە ئەم کارانە هەیە و لە کوێیە لە هەمان کاتیشدا خاوەن کارەکانیش هەوڵ دەدەن کرێکاری تر بدۆزنەوە بۆ ئەوەی جێگای ئەو کرێکارانەیان بۆ بگرنەوە کە خەریکە تەمەنیان بەسەردەچێ و خانەنشین دەبن یاخود بەهۆی فراوانبوونی دەزگاو کارگەکانیان پێویستیان بە کرێکاری تر هەیە.

ب- بێکاری پەیکەربەندی (ژێرخان):

بەشێك لەو کرێکارە نەشارەزاو ناکارامەنە دەگرێتەوە کە ناتوانن کار بکەن لە پیشەسازی و کشتوکاڵی تازە و پێشکەوتوو بەهۆی پێشکەوتنی شێوازەکانی بەرهەمهێنان و ڕانەهێنانی ئەم کرێکارانە، واتە نەگونجانی تواناکانی ئەو کرێکارانە لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو بازاڕی کارە، ئەم جۆرە بێکارییە زۆر

دەخايـەنێ بـۆ كرێكارەكـە تـا خـۆی رادەهێنـێ لەسـەر ئـەو پێشكەوتنانەی بەسەر ئەم بوارانە داهاتن.

هەر لەنێو ئەم جۆرە بێكارییە ئەم دەرچووانە دەگرێتـەوە كـە ژمارەيـان زۆر زيـاترە لـە پێداويسـتی بـەو پسپۆريانە وەك ژمـارە زۆرەی دەرچـووان (لـە ئەندازياران، پزيشكان، مامۆستايان، ژمێرياران) كە زۆر زياترە لە پێداويستی بازاڕ واتـە پەيكەربەنـد و ژێرخـانی ئـابووری ناتوانـێ ئـەو ژمـارە زۆرە لـەخۆ بگرێ.

ئەم جۆرە بێكارييـە زيـاتر لـە ولاّتـانی تـازە پێگەيشتوو بەرچـاو دەكـەوێت، چونكە زيادەيەكی زۆری دەستی كاری ناشارەزا و هونەری كەڵەكە بـووە كـە لەگەڵ پێداويستييەكانی بازاڕدا ناگونجێت، ئـەمجۆرە بێكارييـە لـە ئـەنجامی نـەبوونی بنـەماكانی ديكـەی بەرهـەمهێنان دروسـت دەبـێ كـە لـە پرۆسـەی بەرهەمهێنان پێويستە.

دوو رەهەندی جياواز هەيە لەسەر ئەم جۆرە بێكارييە:

١- نەگونجان لە نێوان توانای بێكاران و ئەو شارەزاييەی هەيانە لەگـەڵ ئـەو پێداويستييەی كە هەلی كار دەيەوێ.

٢- نەگونجان لەنێوان ئەو شوێنەی كاری تێدايـە و ئـەو شـوێنەش كـە بێكـار دەيەوێ كاری لێبكات.

## ج- بێكاری ناو بە ناو: Cyclical Unemployment

بێكاری ناو بە ناو بە بێكارييەكی زۆرەملێ دادەنرێت و بەسـتراوەتەوە بە هەڵكشان و داكشانی چالاكی ئابووری كە بە بارگۆڕان ناودەبرێـت ( Trade Cycle) كە لەكاتی وەستاوی و داكشانەوە دەدردەكـەوێت، چـونكە خواسـتی هـەمووەكی لـە سـەر شمـەك و خزمەتگوزارييـەكان كـەم دەبێتـەوە، خـاوەن

کارەکـان هەڵدەسـتن بەدەسـت هـەڵگرتن لـە بەشـێك لـە کرێکارەکـان، ئابووریناسان و بەرپرسە دەسەڵاتدارەکان بایەخێکی زۆر بەمجۆرە بێکارییـە دەدەن، ئەمـەش لـە ئاکـامی ئـەو مەترسـیە زۆرەی کـە لێـی دەکەوێتـەوە. هەوڵیش دەدەن توانای بەرهەمهێنان دانەبەزێتە خوارەوە، هاوکات هەوڵی بە دیهێنانی ئاستێکی گونجاو دەدرێت لە چالاکییە ئابوورییـەکان، کـە وادەکـات ئەمجۆرە بێکارییە دەرنەکەوێت و کاریگەرییە خراپـەکانی کـەمتر بێـت کـەمتر کاریگەری هەبێت.

هـەر چـەند ئـابووری وڵاتـانی تـازە پێگەیـشتوو زیـاتر پـێش بکـەوێ و پەیکـەری ئـابووری جۆراوجـۆرتر بـێ، ئـەوا کاریگەرییـە بارگۆڕانەکـە کـەمتر دەبێت لە سەرئابوورییەکانی دیکە و بە پێچەوانەشەوە راستە.

## د- بێکاری وەرزی: Seasonal Unemployment

لـە ئاکـامی کەمبوونـەوەی خواسـت لەسـەر کرێکـاران روودەدات، بـە واتایەکی تر زیادبوونی خستنەرووی کـار لـە وەرزێکـی دیـاریکراودا. لەوانەیـە وەرزەکانی ساڵ یاخود وەرزێکی تر، کە وا دەکـات کـاتێکی دیـاریکراوی لـەو ساڵەدا بێکاری زۆربێت، بۆ نموونە لە زستاندا کرێکـارانی خـانوو و بیناسـازی یاخود لە زستاندا کارمەندانی بواری گەشتوگوزار بێکار دەمێننەوەو کەچی لە وەرزێك کە ئاووهـەوا لـەبار بێـت واتـە کەشـێکی دیـاریکراو و گونجـاو یـاخود ئاسایی بێـت، ئـەو کاتانـەی گەشـتیاران نـەبێت کاریـان لـە دەسـت دەچـێت، ئەمجۆرە بێکارییە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوودا زیاتر بڵاو دەبێتەوە کە چڕی دانیـشتووانیان زۆرە و بەرێژەیـەکی گـەورە پـشت بـە چـالاکی کـشتوکاڵی دەبەسـتن، چـونکە پێویـستی بـە برێکـی کـەمی سـەرمایە وئاسـتێکی کـەمی

شارەزایی و تەکنیکی هەیە، زیادبوونی کارمەند و کرێکار لەم کەرتەدا دەبێتە هۆی زیادبوونی داواکاری لە سەر کرێکار لە وەرزەکانی کشتوکاڵ یاخود درۆینە لە نێوان ئەو دوو ماوەیەشدا بەشێکی زۆری کرێکاران بێکار دەبن.

**٢- بێکاری ئارەزوومەندانە :** Voluntary Unemployment

ئەمجۆرە بێکارییە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە توانای کاریان هەیە، بەڵام بە هۆی نزمی کرێکانیان ئامادەنین لەو بوارانەدا کار بکەن، بۆ نموونە ئەو کەسانەی داوای کرێیەکی زۆر دەکەن یاخود هەندێ لە سواڵکەرەکان پارەی کەم وەرناگرن یاخود ئەو کەسانەی پێشتر کارێکیان کردووە و مووچەکەی زیاتر بووە لەو کارەی کە ئێستا دەستی دەکەوێت، ئەمجۆرە بێکارییەش ناچێتە چوارچێوەی (هێزی کار لە ناو کۆمەڵگە).

**دووەم/ بێکاری شاراوە (نادیار- ژێر پەردە):** Unemployment Disguised

پێی دەوترێت شاراوە یاخود ژێر پەردە، چونکە نادیارە، ئەو کرێکارانە دەگرێتەوە کە لە ئاستێکی نزمی بەرهەمهێنان کار دەکەن، بگرە بەرادەیەك ئاستی بەرهەمهێنانیان (سفر)ە، واتە کرێکاران بەکەمتر لە توانای بەرهەمهێنانی خۆیان کاردەکەن، زۆرجاریش ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران لە کەرتێکدا کار دەکەن بێ ئەوەی زێدە رێژەیەك بخەنە سەر بەرهەمەکە لەو کەرتەدا، خاوەنی بەرهەمێکی ڕاستەقینەیی نین، سەرجەمی بەرهەمهێنانیان سفرە و زۆربەی جاریش سالبە، دوو لێکدانەوە بۆ ئەمجۆرەی بێکاریی هەیە:

١) ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کار دەکەن، بەڵام بە هەموو تواناکەیانەوە نییە، یاخود لە بواری وادا کاردەکەن کە رێژەی بەرهەمهێنانی زۆر کەمترە بە بەراورد بەکاری تر.

٢) ئـەو کەسـانە دەگرێتـەوە کـە لـەو کارانـەدا کـار دەکـەن کـە ڕێـژەی بەرهەمهێنانی سنووورداری (**الانتاجیة الحدیة**) زۆر کەمـە یـاخود هـەر نییـە یان سالیبە، ئەم بۆچوونەش زیاتر بڵاوە.

ئـەمجۆرە بێکارییـە زیـاتر لـەبوارەکانی کـشتوکاڵی سـەرەتایی یـاخود کارەکانی کەرتی گشتی حکومەت بەدیار دەکەوێـت، واتـە ژمـارەی کرێکـاران لە یەکەیەکی بەرهەمهێنان زۆر زیاترە لەو ژمارەیەی کە پێویستی پێیە، واتـە کێڵگەیەك دەکرێت بە دوو کرێکار بـەڕێوە بـچێت کەچـی پێـنج کرێکـار کـاری تێدا دەکات، ئەم شێوازەش لە کشتوکاڵی سەرەتایی ڕوونتر دیارە بۆ نموونـە خێزانێکی (دە) کەسی کە چواریان توانـای کاریـان هەیـە لـە زەوییەکـەدا لـە ماوەیـەکی دیـاریکراوی سـاڵ کـار دەکـەن، کاتێـك کاتـەکانی کارکردنیـان دەژمێردرێت بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر تـەنها یـەك کرێکـار ڕۆژی هەشـت کاتژمێر کار بکات ئەوا زیاتر لە سـەرجەم کاتـەکانی ئـەو چـوار کەسـە کـاری کردووە.

هاوکات فەرمانگەیەکی حکومەت کە پێنچ فەرمانبەر کاری تێدا دەکات، گەربێت و کاتـژمێرەکانی ڕۆژانـە حـساب بکـرێن بـۆ نموونـە شـازدە کاتـژمێر دەردەچێت، کـە واتـە بـە ژمـاردنی کاتـەکانی کـار کـە هەشـت کاتـژمێرە لـە ڕۆژێکدا ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو فەرمانگەیە سێ کەسی زیادەیـە کـە دەچنە ناو قاڵبی بێکاری شاراوە، بەڵام نازانرێت ئەو سێ فەرمانبەرە بێکـارە کێیە، چونکە هەر پێنچ فەرمانبەرەکە بەکارکەر دادەنرێن.

ئەمجۆرە بێکارییە زیاتر لـە وڵاتـانی تـازە پێگەیـشتوو سـەر هەڵـدەداو تەشەنە دەکات، ئەمە لە کاتێکدا هەڵی کارکردن سنووردارو کەمە، بە تایبەت لە بوارەکانی بەرهەمهێنان، ئەمەش وا دەکات کەسـەکان لـە هـەموو کارێکدا کار بکەن تەنانەت ئەگەر لە ئاستێکی نزمدا بێت و بەرهەمەکەشی کـەم بێـت، ئـــەوەی بارودۆخەکـــەی ئـــاڵۆزتر کـــردووە، نزمـــی ئاســـتی فێرکـــردن و بەرزبوونەوەی ڕێژەی دەستی کاری نا شارەزا.

## شوێنەوارەکانی (کاریگەری) بێکاری:

زۆرینەی ئابووریناسان لە کاتی لێکۆڵینەوەی بێکاری جەخت لەسەر کاریگەرە ئابوورییەکانی دەکەنەوە، گەرچی شوێنەواری بێکاری ڕەهەندە ئابوورییەکان تێدەپەڕێنێت و لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونیشی دەگرێتەوە، بۆیە زیاتر باس لە هەر سێ شوێنەواری (ڕەهەندەی) بێکاری دەکەین:

## یەکەم : شوێنەوارە ئابوورییەکان:

کار ڕەگەزێکی بەرهەمهێنانە و هەر کەموکورتییەك لەم ڕەگەزە ڕوویدات واتە لە دەستدانی بەرهەمهێنانە لە کۆمەڵگە، چونکە بەشداری لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا ناکات، لەلایەکی ترەوە کرێکاری دەست بەتاڵ توانای بەدەستهێنانی داهاتێکی نییە، واتە توانای بۆ کرینی کەمە یان هەر نییەو ئەمەش کاریگەری لەسەر قەبارەی خەرجی گشتی هەیە، ئەمەش وادەکات ئاستی خواستی گشتی دادەبەزێت، کەمبوونەوەی داواکاری گشتی کاریگەری خراپی لەسەر داکشانەوەی یان بێ بزووتی ئابووری نیشتمانی هەیە، چونکە خواست پاڵنەری بەرهەمهێنانە، کەمبوونەوەی خواست و داواکاری بەرهەمهێنانیش کەم دەکاتەوە، کە لە کۆتاییدا بێکارییە کە ئاڵۆزتر و فراوانتر دەکات.

بەمشێوەییە شوێنەوارەکانی ئابووری لەسەر بێکاری راستەوخۆ (نەرێنییە)، چونکە دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی داهاتەکانیان یاخود دەگاتە سەر سفر، لەم حالەتانەدا بێکارەکان پەنا بۆ خەرجکردنیئەو پارەیە دەبەن کە پێشتر پاشەکەوتییان کردووە، نزمبوونەوەی داهاتی تاکەکەسی یاخود نەبوونی داهات دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئاستی خەرجییەکان، لەئەنجامدا کار دەکاتە سەر تەندروستی تاکەکان و ڕێژەی بەرهەمهێنانیان کەم دەبێتەوە.

شوێنەوارە ئابوورییەکانی بێکاری تەنیا کار ناکاتە سەر بێکارەکە، بەڵکو کار دەکاتە سەر ئابووری وڵاتیش، چونکە لەکاتی وەستاوی و داکشانەوەی ئابووری، واتا بوونی بێکاری و وەستانی جموجوڵ و چالاکییەکانی بەرهەمهێنان و کڕین و فرۆشتن، وادەکات تێکڕای وەبەرهێنان نزم بێتەوە، کە بەبزوێنەری سەرەکی چالاکی ئابووری دادەنرێت، لێرەدا دەکرێت شوێنەوارە خراپەکانی بێکاری کۆبکەینەوە کە لە دەرئەنجامدا تێکڕای گەشەکردنی سەرجەم بەرهەمی ناوخۆی و پەرەپێدانی ئابووری نزم دەبێتەوە.

## دووەم: شوێنەوارە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان:

بێکاری کاریگەری خراپی لەسەر باری دەروونی و کۆمەڵایەتی تاکی بێکار هەیە، هەستکردن بە دارمان و باوەڕ بەخۆ نەبوون و بگرە پابەندبوون (ئینتمابوون) بۆ ژیان لاواز دەکات، ئەم هەستە زیاتر دەبێت تاوەکو مەودای بێکارییەکە زیاتر بێت، و ئەم هەستەش کاریگەریشی لەسەر کۆمەڵگای بێکار کاریگەرییەکی کاولکارە، بە تایبەت مەسەلەی ئینتما کە هۆکارێکی بنەڕەتی لەسەر پرۆسەی پەرەپێدانی سەرتاسەری (سەرتاپاگیر) هەیە، کەسایەتی بێکار کە هەست بەوە دەکات مافی خۆیەتی لە بەدەستهێنانی کار و هەلی باشتر زۆر زەحمەتە ڕەزامەندی لەسەر هاوکاری و هەماهەنگی لە پرۆگرامی پەرەپێدان لە ناوخۆی وڵاتدا، زۆرجاریش شوێنەوارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی بێکاری دەبێتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی بێکاری و تاوان و زیادبوونی هەڵوەشانەوەی خێزان.

دەکرێت شوێنەوارە کۆمەڵایەتییەکانی بێکاری لەم خاڵانەی خوارەوە پوخت بکرێنەوە:

١- هەستکردن بەدارمان و بۆشایی و بێزاری دەبێتە هۆی لادانی ڕەوشتی تاکەکان لەناو خێزان و کۆمەڵگە.

٢- هەستکردن بە خۆ ونکردن دەبێتە هۆی دزی و تاوان و هەڵوەشانەوەی خێزان.

٣- دڵەڕاوکێ و نائارامی لە ناو کۆمەڵگەدا بەهۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی تاوان.

٤- پشێوی بارودۆخەکە، کە جێگیرنەبوونی رامیاری دەوڵەت و ئەگەری گۆڕانی حکومەتەکانی بە دوایدادێت.

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

**پ١: یەکێك لەو خاڵانەی تایبەتە بە وەڵامی پرسیارەکە هەڵبژێرە :**

١. ئـەو بێکاریـەی لـە ئاکـامی گۆڕانکـاری لـە جـۆری پێداویـستی تواناکـانی کرێکـاران دەکەوێتەوە پێی دەڵێن:

أ – بێکاری پەیکەربەندی.

ب – بێکاری ناو بە ناو.

ج – بێکاری شاراوە.

د – بێکاری نەگونجاندن (بەریەك کەوتن)

٢. ئەو بێکاریەی لە ئاکامی کات بـەفیڕۆدانی بێکـاران بـۆ گـەڕان بـە دوای کارێکـدا کـە لەگەڵ توانکانیاندا بگونجێت پێی دەگوترێ:

أ – بێکاری پەیکەربەند.

ب – بێکاری ناو بەناو.

ج– بێکاری شاراوە.

د – بێکاری وەرزی.

٣. ئابووری گۆڕاو بە بەردەوام:

أ – دووچاری بێکاری بەریەککەوتن و پەیکەری دەبێتەوە.

ب – تەنها دووچاری بێکاری ناو بە ناو دەبێت.

ج – نەمانی بێکاری.

د – بێکاری شاراوە نییە.

٤. زیادبوونی کاتی گەڕان نموونەیی بۆ کار:

أ – ڕێژەی بێکاری کەم دەکاتەوە.

ب – ڕێژەی بێکاری زیاد دەکات.

ج– نرخی خستنە ڕوو کەم دەکاتەوە.

د – نرخی خستنەروو زیاد دەکات.

٥. تێکڕای بەکارخستنی یەکسانە:

أ – ژمارەی ئەو کەسانەی کار دەکەن دابەشکراوە بەسەر ژمارەی بێکاران.

ب – ژمارەی کەسە بێکارەکان دابەشکراو لە سەر ژمارەی دانیشتوانی مەدەنی.

ج – ژمارەی کەسە کرێکارەکان کە دابەشکراون لەسەر هێزی کارکردنی مەدەنی

د – ژمارەی ئەو کەسانەی کاردەکەن دابەشکراون لەسەر ژمارەی دانیشتوانی مەدەنی

**پ٢: ئەم دەستەواژانەی خوارەوە بە ڕاست ( ✓ ) یان هەڵە (×) وەڵام بدەرەوە:**

١. زۆربەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان و تاوانەکانی ڕۆژانە هۆکارەکەی بۆ بوونی کێشەی بێکاری دەگەڕێتەوە.

٢. ڕێژەی بێکاری بەم شێوەیە پێوانە دەکرێ:–

٣. بێکاری پەیکەربەندی، لە ئاکامی زیادەی هێزی کاری نا هونەری دەکەوێتەوە، کە ناکرێت لە کەرتی کشتوکاڵ و پیشەسازی بەکاربهێنرێت، چونکە ئەو دوو کەرتە پێویستیان بە توانایەك هەیە بگونجێت لەگەڵ شێوازی نوێی بەرهەمهێنان.

٤. نیمچە بێکاری بەو ناوە ناونراوە، چونکە بێکاریەکی تەواوە لە ناو کۆمەڵگادا.

**پ٣: پێناسەی ئەم چەمکانەی خوارەوە بکە :**

بێکاری بەیەك کەوتن(بەریەك کەوتن)– بێکاری شاراوە–گەڕان بەدوای کار – کار – هێزی کار – بەکارهێنانی تەواو.

**پ٤: چەمکی بێکاری روون بکەرەوە، چۆن تێکڕای بێکاری دەپێورێت ؟**

**پ٥: بێکاری هۆکاری ناوخۆیی هەیە، ئەو هۆکارانە دیاری بکە و روونیشیان بکەوە؟**

**پ٦: کۆمەڵێك بێکاری هەیە کە لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی تر جیاوازەو دەوڵەتێك بۆ دەوڵە تێکی تر دەگۆڕێت، بە شێوەیەکی درێژ جۆرەکانی بێکاری روون بکەرەوە.**

**پ٧: گرنگترین ئەو رێو شوێنانەی بژمێرە کە بۆ نەهێشتنی دیاردەی بێکاری بەکاردێت.**

پ٨: وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بێکاری کاردەکاتە سەر خۆشگوزەرانی ئابووری بەزۆری لەخستنەرووی بازاڕدا تەنها لەبازاڕی کار نەبێ؟

٢. گرنگترین ئەو هۆکارانە چین کار لە توانای کارکردن دەکات؟

٣. باسی دەستەی دانیشتوان بکە بۆ کارکردن.

٤. ئەو بۆچوونانە روون بکەوە کە لەبارەی بێکاری شاراوە هەیە.

٥. باسی کاریگەری بێکاری بکە.

٦. رۆڵی سیاسەتی دارایی و نەختینەکی لە چارەسەرکردنی بێکاری.

٧. کاریگەرە کۆمەڵایەتیەکانی بێکاری روون بکەوە.

پ٩: لەم خشتەیەی خوارەوە ژمارەی کرێکاران و ژمارەی بێکارانی وڵاتێک پیشان دەدات.

داواکراو: تێکڕای بێکاری بدۆزەوە:

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی کرێکار | ژمارەی بێکار | تێکڕای بێکاری ٪ |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٨ | ٢٠٠٠٠٠٠ | ٥٠٠٠٠٠ | ٧٥٠٠٠ | |
| ١٩٩٩ | ٢٥٠٠٠٠٠ | ٨٠٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠٠ | |
| ٢٠٠٠ | ٣١٥٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠٠٠ | ١٥٠٠٠٠ | |
| ٢٠٠١ | ٣٨٥٠٠٠٠ | ١٣٠٠٠٠٠ | ٢٠٠٠٠٠ | |
| ٢٠٠٢ | ٤٣٥٠٠٠٠ | ١٦٠٠٠٠٠ | ٢٧٥٠٠٠ | |
| ٢٠٠٣ | ٥٠٠٠٠٠٠ | ١٩٥٠٠٠٠ | ٣٢٥٠٠٠ | |
| ٢٠٠٤ | ٥٦٠٠٠٠٠ | ٢٢٥٠٠٠٠ | ٤٠٠٠٠٠ | |
| ٢٠٠٥ | ٧١٥٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠٠٠ | ٤٩٠٠٠٠ | |

پ١٠: گرنگترین شوێنەوارەکانی (کاریگەری) بێکاری روون بکەوە.

## سەرچاوەکانی بەشی شەشەم


١. د.حربي محمد موسى عريقات،مبادئ الاقتصاد : التحليل الكلي، الطبعة الاولى، دار وائل للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٦.

٢. حسام داود و مصطفى سلمان و عماد الصعيدي واخرون، مبادئ الاقتصاد الكلي، الطبعة الثانية، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، عمان، ٢٠٠١.

٣. د. حسن علي سليمان، اقتصاديات العمل وسياسات الاستخدام، الكويت، ١٩٨٥.

٤. د. خالد واصف الوزني ود. احمد حسين الرفاعي، مبادئ الاقتصاد الكلي بين النظرية والتطبيق، الطبعة السابعة، دار وائل للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

٥. سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة : خضر نصار، مركز الكتب الاردني، دون مكان، ١٩٨٨.

٦. طاهر حيدر حردان، مبادئ الاقتصاد، الطبعة الاولى، دار المستقبل للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٩٧.

٧. د. عادل فليح العلي و هناء هادي محمدعلي وشاؤول ايشو، اقتصاد العمل، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٠.

٨. د. علاء شفيق الراوي و د. عبدالرسول عبد جاسم، اقتصاد العمل، الطبعة الثانية، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٨٦.

٩. ____ و ___، اقتصاد العمل، الطبعة الثانية مزيدة، مطبعة العمال المركزية، بغداد،١٩٨٩.

١٠.د. صادق مهدي السعيد، عقد العمل والاجور في الاسلام، بحث منشور في ندوة الاقتصاد الاسلامي، معهد البحوث والدراسات العربية، بغداد، ١٩٨٣.

١١. د. علي عبدالوهاب نجا، مشكلة البطالة واثر برنامج الاصلاح الاقتصادي عليها دراسة تحليلية – تطبيقية، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٥.

١٢. د. مجيد علي حسين و د. عفاف عبدالجبار سعيد، مقدمة في التحليل الاقتصادي الكلي، الطبعة الاولى، دار وائل للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

١٣. محمد سلمان محمد، بطالة الخريجين في اقليم كوردستان (دراسة تطبيقية في مدينة اربيل)، مجلة الادارة والاقتصاد، العدد٥٢، الجامعة المستنصرية، بغداد، تموز٢٠٠٤.

14. Belton، M. Fleisher، "Labor Economics: Theory and Evidence "، Prentice Hall Inc.، New Jersey، 1970.

15. Delong، J. Bradford، " Macroeconomics "، Int'l ed.، McGraw-Hill، Irwin،2002.

16. Smith،W.Stephen،"Labor Economics، First ed.، Routledge، London، 1994.

17. Whitehead، Geoffrey، " Economics "، Int'l ed.، Heinemann، London، 1988.

18. Zimmermann، Klaus،" Frontiers in Economics"، Springer، Berlin،2002..

# بەشی حەوتەم

# جیهانگیری (العولمە)

# GLOBALIZATION

## چەمکی جیهانگیری: The Concept Of Globalization

لە نەوەدەکانی سەدەی بیست زۆر گۆڕانکاری جیهانی و خێرا و یەك لە دوای یەك و کاریگەر روویاندا، کە شوێنەواری لە سەر ئایندەی و تێڕوانینەکان هەبوو، ئابووری جیهانی بەراستی کردە گوندێکی بچووك، گوندێك کە چەندین پێگە و لایەنی تێدا گەشەی کرد، ئەمەش لە ئاکامی شۆرشی تەکنەلۆژیا و زانیارییەکان روویاندا، بەم شێوەیە یەك بازاڕ لە چوارچێوەکی فراواندا دامەزراو بواری بۆ سەرجەم کێبرکێکان و مامەڵە نێو دەوڵەتییەکان کردەوە، بە جۆرێك کاراکتەرەکان لە بازاڕە جیهانییەکەدا تەنیا حکومەت و دەوڵەتەکان نین، بەڵکو رێکخراوە جیهانی و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و کۆڕبەستە ئابوورییەکانیش (التکتلات الاقتصادیة) دەگرێتەوە.

بازاڕە جیهانییەکان و جموجوڵی نرخەکان وگۆڕانکاری لە سەر قەبارە و جۆری بەرهەم و ئاراستە بازرگانییە جیهانییەکان و جموجوڵی سەرمایەداری دروست کرد، کە بە شێوەیەکی کاریگەر لە جامبازیی (Spread) نێو دەوڵەتی بە کاردەهێنرێت بە تایبەت جامبازیی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان، کە بە بەردەوامی کار بۆ کەمکردنەوەی خەرجی و تێچوونی گواستنەوەو گەیاندن دەکات وپاشان هەوڵی بەدیهێنانی تەکنەلۆژیای گەورە دەدات تا وەکو جیهانگیری بهێنێتە دی.

له سەر ئەم بنەمایە جیهانگیری (Globlization) تەشەنەیکرد (لەڕووی زاراوەوە بەمانای گشتاندنی شتێك و بەخشینی مۆرکێکی جیهانی بەو شتە و فراوانکردنی ئەو بازنەیە، بۆ ئەوەی هەموو جیهان بگرێتەوە) لە سەرجەم ئاستەکانی بەرهەمهێنان و پارەدارکردنی دارایی و تەکنەلۆژیا و بە خستنەبازاڕ و کارگێری، لەلایەکی تر جۆرەکان و بوارەکانی پڕاکتیزەکردنی چەندین شێوەی هەیە.

بۆ نموونە جیهانگیریەکی ئابووری هەیە کە بەبنەڕەت و سەرچاوەی هەموو شێوەکانی تر دادەنرێ کە دابەش دەبێتە سەر جیهانگیری بەرهەمهێنان و جیهانگیری دارایی، هاوکات چەند دووکەوتەیەکی تری جیهانگیری ئابووری هەیە لە وانە جیهانگیری رامیاری و جیهانگیری رۆشنبیری و جیهانگیری کۆمەڵایەتی.

## پێناسەی جیهانگیری ئابووری:

بۆ پێناسەکردنی جیهانگیری پێناسەیەکی یەککگرتوی سەرتاپاگیر کۆك بۆ زاراوەی (Globlization) (جیهانگیری) نییە، بەهۆی ئاڵۆزی ناوەرۆکی هزری زاراوەکە و تەوەری ئابووری لەگەڵ تەوەرەکانی تری رامیاری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژیا و زانیاری تێکەڵ بە یەکتر بووە، جیهانگیری زاراوەیەکی دینامیکیە و لەگەڵ گۆڕانکارییە جیهانییەکان دەجولێت و دروست دەبێت و پێك دێت.

لەگەڵ ئەمەشدا جیهانگیری بە شێوەیەکی سەرەکی و بنەڕەتی زیاتر لایەنە ئابوورییەکەی بەسەر بوارەکانی تردا زاڵە، کە دەکرێت ئەو بوارانەی تر بە پاشکۆی جیهانگیری ئابووری دابنرێت، جیهانگیری ئابووری چەمکێکە زۆر بە خێرایی لە سەر سەرجەم ئاستەکانی بەرهەمهێنان ودارایی وتەکنەلۆژیا

وخـــستنەبازاڕ و كـــارگێری تەشـــەنە دەكات،لـــە زانـــستە ئابووریـــەكان وەكوئـامرازێكی توێژینــەوە دەردەكــەوێت بـۆ دەستنیـشانكردنی پرۆســەی گۆڕانی ئـەو بوارانـە، بـە لەبەرچـاو گـرتنی ئـەوەی جیهـانگیری پرۆسـەیەكی بەردەوامـە، بـە بـەكارهێنانی نیـشانەكانی چـەندایەتی و چـۆنیەتی لـە بـوارە پراكتیكییە جۆراوجۆرەكاندا دەكرێت تێبینـی بكرێـت، هـەروەها دەكرێـت لـە ڕێگای پرۆسە بنەڕەتییەكانی كـە جیهـانگیری لـە چـوار دەوری دەخولێتـەوە تێبینی بكرێت، كە كێبركـێ و داهێنـان و تەكنـەلۆژیا و ئـازادكردنی بازرگـانی نێو دەوڵەتی و نوێكردنەوە و تەشەنەكردنی جیهانگیری بەرهەم و جیهانگیری داراییە، كە پێكهێنـەری سـەرەكی جیهـانگێری ئابوورییـە لـەو ڕوانگەیـەی : هەردوو پرۆسەی دوای (جیهـانگیری بەرهـەم و جیهـانگیری دارایـی) لـە سـەر بنەمای پشت بەستن بە ئاڵوگۆڕی (مبدأ الاعتماد المتبادل Interdependence) هاوبەش دامەزراوە.

دەتوانین بڵێین: داڕشتنی پێناسەیەكی وردو زانستییانە بـۆ جیهـانگیری مەسـەلەیەكی ئاسـان نییـە بـەهۆی زۆری پێناسـەكان، كـە لـە سـەر بنـەمای كاریگەری هزر وتێڕوانینی جۆراوجۆری نووسەر و لێكۆڵـەرەوە و ئایـدۆلۆژیا و تێڕوانینیان بۆ جیهانگیری پەسەندی بكەن یان ڕەتیبكەنـەوە دامـەزراوە. بـۆ نزیكبوونەوە لە پێناسەیەكی سەرتاپاگیر ( شامل ) بـۆ جیهـانگیری پێویـستە ڕەچاوی سێ لایەن بكەین بۆ بە ڕوونكردنەوەی ناوەڕۆكەكەی:

١- لایـەنی یەكـەم: پەیوەنـدی بـە تەشـەنەكردنی زانیـاری و شۆڕشـی زانیارییەكانەوە هەیە كە لە بـەردەم سـەرجەم هاووڵاتیـان دابـین و فەراهـەم كرابێت.

٢- لایەنی دووەم: پەیوەندی بە لابردن و هەڵگرتنی کۆت و بەربەستە سنووریەکانەوە هەیە لە نێوان وڵاتان.

٣- لایەنی سێیەم: زیادبوونی ڕێژەی لێکنزیکبوونەوە و لێکچوونی نێوان گروپ و کۆمەڵگە و دامەزراوەکانە.

سەرجەم ئەم پرۆسانە ڕەنگە کاریگەری خراپی لە سەر هەندێك ئابووری هەبێ و بە پێچەوانەشەوە بۆ هەندێ لە ئابوورییەکانی تر بە ئیجابی بکەوێتەوە. ئەمەش بە ڕەچاوکردنی ئەوەی: جیهانگیری لە ڕێگای تەکنەلۆژیا گەیاندن و کێبڕکێ و گفتوگۆی نموونەیی دەزگاکان ڕوودەدات، کە لە ڕێگای میکانزمی دیاریکراو دەچێت بەڕێوە و پێی دەگوترێت : میکانزمەکانی جیهانگیری.

## میکانزمەکانی جیهانگیری:

گرنکترینیان :

١- نوێکردنەوە.

٢- شۆڕشی تەکنەلۆژیا و زانیارییەکانە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەش زانینی گرنگترین پێناسەکانی جیهانگیری کارێکی پێویستە، هەوڵێکە بۆ قووڵبوونەوە بە ناو ڕەهەندە جیا جیاکانی ئەم چەمکە، بگرە هەوڵێکیشە بۆ گەیشتن بە پێناسیەکی گونجاو :

زاراوەی جیهانگیری (Globlization) ئاماژە بە پرۆسەیەکی چڕ و قووڵی پشت بەستن بە ئاڵوگۆڕی نێوان دوو بکەر Actors لە ئابووری جیهانی دەکات، بە شێوەیەك ڕێژەی بەشداریبوونی لە ئاڵوگۆڕی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە ئابوورییە نێو دەوڵەتیەکان زیاد دەبێت، لە ڕوانگەی ئاست و قەبارە و قورسایی سەرجەم بوارەکان گرنگترینیان شمەك و خزمەتگوزاری و توخمەکانی بەرهەم، بەشێوەیەك سەرجەم ئەم بوارانە لە پرۆسەی ئاڵوویری

بازرگانی نێودەوڵەتی گەشە دەکەن و ڕێژەیەکی گرنگ لە چالاکی ئابووری گشتی پێک دەهێنن، شێوازێکی نوێ لە پەیوەندییە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانی ئابووری جیهانی دروست دەبێت و ڕۆڵێکی گرنگی بە بەراورد بە چالاکی ئابووری ناوخۆ گەورەتر دەبێت.

دەتوانین بڵێین بۆ بەجیهانیبوون چەند دابەشبوونێك هەیە، (لەوانە جیهانێکی کراوە بێت و پابەندی هیچ کۆت و بەربەستێك نەبێت)، (ڕەنگیشە پابەندی جۆرە مەرج و ڕێنماییەکی دیاریکراو بێت)، (یاخود جیهانی ئاینی و زانستی و ئایدیۆلۆژییەت بێت، چونکە کرانەوە بەرووی جیهاندا لە ڕێگای هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی هزرێك یاخود بیروباوەڕێك یا پرۆگرامێك لە سەر ئاستی جیهانی و داننان بە راوبۆچوونی بەرامبەر بەدیاردەکەوێ) واتە بەو ئاراستەیە دەڕوات دەسەڵات بۆ بەها و بیروباوەڕێکی جیهانی لە نێوان نەتەوەکان بڵاو بکاتەوە وەکو ئەوەی هەردوو ئاینی ئیسلامی و کریستیانی(مەسیحی) بانگەشەیەکی جیهانی بوون دەکەن، مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و لێبوردن و دادوەری دابین دەکەن، بیروباوەڕەکانی تریش بەهەمان شێوە.

بەڵام جیهانگیری بەوە جیا دەکرێتەوە کە سەروەری بازاڕی جیهانی لە دەسەڵات بێت و بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای زانیاری و هەڵگرتنی سەرجەم کۆت و بەربەستەکان لە ناوخۆ یاخود دەرەوە پەیڕەو دەکات هەر یەکە بۆ کۆنترۆڵکردن و بە هاوشێوەکردنی حەز و ئارەزوەکان وروخسارێکی دیاریکراو بە کردار و بەکارهێنان و پەرەپێدان دەدات و یەك جۆر و سەر بە یەك ڕۆشنبیری و کولتور دەچەسپێنێت، هەوڵی چەسپاندنی واقیعێکی نوێ دەدات لە ڕێگای بەنکی زانیاری و مەعریفەوە کە سەرجەم کارەکان بۆ داتای ژمارەیی دەگۆڕێت.

## مێژووی پەیدابوونی جیهانگیری:

مێــژووی پەیــدابوونی جیهــانگیری تــاکو ئێــستا مایــەی گفتوگــۆو راوبۆچـوونی جیـاوازی توێـژەرەوان و هزرمەندانـە، زۆر جـار بـە دیاردەیـەکی تـازە ناودەبرێـت. کەسـانێکی تـری شـارەزا بـە پرۆسـەیەکی مێـژوویی نـاوی دەبەن کە بە چەند قۆناغێکی جیاوازی مێژوویی تێپەڕ بووە.

ئەم باسە کەمێك بە درێژی و وردەکاری درێژتر باس دەکەین بۆ ئەوەی بۆمان دەربکـەوێت کـە دیاردیـەکی تازەیـە یـاخود مێژووییـە، لـە میانـەی ئـەم باسکردنە:

توێژەرانی مێژوو وای بۆ دەچن کە: بەردەوام هێزێکی گەورە هەیـە دەیـەوێت لە فەرمانڕەوایی جیهان و دەست بەسەرداگرتنی (کۆنترۆڵکردنی) باڵا دەسـت بێت، یۆنان و رۆمان و فارس و تەتەرو ئیمپراتۆرییە تازەکـان هـەموویان بـەو ئاراستەیەی کۆنترۆڵ و خۆسەپاندن چوون.

مێژووناسان لێکۆڵینەوە لە سەر زاراوەی جیهانی بوون دەکەن، ئەمەش روون دەبێتەوە لە رێگای خستنەڕووی پیاوانی شارەزای ئەسـیناوە کەلـە سـەدەی سێی پـێش زایـین بەچـاوێکی سـەراپاگیرانە سـەیری جیهانیـان دەکـرد بـەبێ ئەوەی هیچ جۆرە هۆکارێکی لێك جیاکردنەوە و هـەلاوێرکردن دیـاری بکـەن، ئالێرەوە بانگەشەکردنیان بۆ دامەزرانی شـارێکی جیهـانی (المدینـة الفاضـلة) لەمەشـدا رەواقییـەکان (هەیوانییـەکان) پـشتیان بـە فەلـسەفەیەك بەسـتبوو کەلەسەر بنەمای یەکێتی هەسارەی زەوی کە سـەرجەم رەگـەزی مرۆڤایـەتی لەسەری دەژین لە بنچینەدا یەك رەگەزن.

رۆمانییەکانیش کاریگەری ئەم بیروباوەڕەیان لە سەر بـوو بـە تایبـەتی ئـەوەی پەیوەنـدی بـە بیرۆکـەی (یاسـایی سروشـت) و (پرەنـسیپی دادوەری

گشتی) هەبوو، شیشرون ( ١٠٦ – ٤١ پ. م ) تیۆری پێشکەش کرد کە لەسەر بنەمای یەك یاسایی دامەزرابوو کە دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم هاوڵاتیاندا هەبوو، ئەویش یاسای سروشت بوو کە بەدەستووری جیهانی ناو دەبرێت، کە دواتر رۆما توانی جیهان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی هزری ئیمپراتۆریەتی جیهانی، رەواقەکان و رۆمانییەکان بیرۆکەی بوونی یەك جیهانیان دامەزراند کە سەرجەم مرۆڤایەتی تێدابێت ولە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی یەك یاسا بێت ئەویش (یاسای سروشت)ـە.

هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان پێیان وایە جیهانگیری دیاردەیەکی تازە نییەو، بەڵام ناگەڕێننەوە بۆ سەدە زۆر کۆنەکان، بەڵکو بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەم لەگەڵ دەست پێکردنی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی بۆ ئاسیا و ئەفریقیاو هەردوو کیشوەری ئەمەریکا، پاشان کەوتە ژێر کاریگەری سیستەمی بازرگانی تازە لە ئەورووپا، ئەمەش وایکرد سیستەمێکی جیهانی ئاڵۆزو تێکەڵاو دروست بوو کە بە جیهانیبوون و دواتر بە جیهانگیری ناوبرا.

لەم چوارچێوەیەدا هەندێك پێیانوایە زاراوەی سیستەمی جیهانی لە کۆنگرەی ڤییەننای ١٨١٥ بەکارهاتووە، ئەو کۆنگرەیەیی (مترنیخ)ی سەرۆك وەزیرانی نەمسا رابەرایەتی دەکرد و لە (بسمارك)ی ئەڵمانی لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە پەرەی پێدراو، لەسەر دەستی (کلیمنسۆ)ی فەرەنسی لە کۆنگرەی فرسای ١٩١٩ نوێ کرایەوە، لە جەنگی دووەمی جیهانی لە ناوەڕاستی سەدەی بیست لەسەر دەستی هاوپەیمانەکان لە (یاڵتە) بەردەوامی پێ درا.

جیهان لە نێوان قۆناغێك و قۆناغێکی تردا یاخود لە وێستگەیەك بۆ وێستگەیەکی تر دەیویست سیستەمی نێو دەوڵەتی دابڕێژێتەوە،

کۆنگرەکـانیش بـۆ ئـەم مەبەسـتە بەسـترا لـە هـەموو جارێکـدا خەسـڵەت و شـێوازێکی جیـاوازی لـە خـۆدەگرت، سیـستەمی نێودەوڵـەتی کەلەسـەدەی نۆزدەیـەم دامـەزرا لـە دوای کـۆنگرەی ڤییـەننا، سیـستەمێکی نێودەوڵـەتی سەربازی کۆلۆنیالیزمی بوو، بەڵام کۆنگرەی ئاشتبوونەوە کەلە سـەرەتاکانی سـەدەی بیـست بەسـترا سیـستەمێکی نێودەوڵـەتی ئیمپریـالی دامەزرانـد، ئێستاکە رۆژئاوا دەیەوێت بیگۆڕێت بە سیستەمێکی تازە کە هەموو نیـشانەو بەڵگەکان وا دەریدەخەت کە سـەدەی بیـست و یـەك سـەرمایەداری ئـابووری دەبێت.

وا تێبینـــی دەکرێـــت جیهـــانگیری هـــەمان روخـــساری دیـــاردەی ســـەرمایەداری لـــەخۆوە گـــرتبێ، گـــەربێتو جیهـــانگیری داوای زیـــادکردنی پەیوەندییەکانی ئاڵوگۆڕی ئابووری نێوان وڵاتان بکات وبانگەشەی زیادکردنی رێـژەی گواسـتنەوەی سـەرمایە و زانیـاریی و هزرەکـان بکـات، هـەموو ئـەم دیاردە کۆنانە دیاردەی سەرمایەداریان هێناوەتە ئارا، و بەردەوامبوونی ئـەم لێکچوونی روخسارەی دیاردەی جیهانگیری بەڵگەیەکە بـۆ بـوونی پەیوەنـدی لە نێوان جیهانگیری و ئەو دیاردە سەرمایەدارییەی کە لە پێشتر هەبووە.

**جیهـانگیری لـە رێگـای سـێ قۆنـاغی سـەرەکی گەیـشتە ئـەم روخـسارە هاوچەرخەی کە ئێستا هەیەتی:**

١- قۆناغی مارکانتالی ( بازرگانی) و سەرمایەداری بازرگانی لە نێوان سـاڵانی ( ١٥٠٠ – ١٨٠٠م ).

٢- قۆناغی پیشەسازی لە نێوان (١٨٠٠–١٩٥٠م ).

٣- قۆناغی سەرمایەداریی هاوچەرخ لە ١٩٥٠ و تا ئێستا.

بەم شێوەیە بۆمان بەدیار دەکەوێت کە جیهانگیری تەنیا ماوەیەك نییە، بەڵکو ئایندەیەکی بەردەوامی سەرمایە دارییە، کە لە هەموو قۆناغێکدا بە شێوەو روخسارێکی جیاواز دەردەکەوێت، بە دیاردەیەکی بە فراوان بوون و تەشەنەکردن و دەست بەسەراگرتنی گەلان ناودەبرێت، لەبەر ئەوەی سەرمایەداری لە پێشکەوتنێکی بەردەوامی پرۆسەی بەرهەمهێنان دایە، بۆیە پێویستە لەگەڵ پێداویستیەکانی هەموو قۆناغێك کە جیهانگیری پێیدا تێدەپەرێ خۆی بگونجێنێ و رەچاوی ئەو رۆڵەی بکرێت کە پێویستی بە نوێبوونەوەی هۆکارو خەسڵەتەکانی هەیە.

ئەو خەسڵەت و نیشانە جیاوازەی کە ئەم سات و قۆناغەی ئێستای جیهان پێیدا تێپەردەبێت بریتییە لە گوێزانەوەی سەرمایەدارییە لە شێوازی سەرمایەداری نیشتمانی و فرە رەگەزییەوە بۆ سەرمایەداری جیهانی، ئەو گۆڕانکاری و چاکسازیانەی کە جیهان لە هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم بەخۆیەوە بینی، بۆتە هۆی تێکچوونی ئەو سیستەمی هەیە کەلەسەر دوو جەمسەری سەرەکی دامەزرابوو (نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیتی جاران) بۆ دەرکەوتنی دەسەڵات و کۆنترۆڵی ئەمەریکی بە تەنیا گرنگترین گۆڕانکارییەکانی سەدەی رابردوو بە تایبەت لە سەرەتای نەوەدەکان بریتیی بوو لە :

١- داڕمانی گەورەترین زلهێزی رکابەرایەتی و لێك هەڵوەشان و داڕمانی سەرجەم ئایدیۆلۆژییە دژ بە سەرمایەدارییەکان کە (کۆمۆنیستە) (شیوعییەتە).

٢- رووداانی تەنگژەی دووەمی کەنداو (١٩٩٠-١٩٩١).

٣- دەرکەوتن و مانەوەی ئەمەریکا بەتەنها بۆ رابەرایەتی کردن و بەرێوەبردنی جیهان دوای رووخانی بەرامبەرەکەی کە (کۆمەنیستە) (یەکێتی سۆڤێت) بوو.

٤- شۆڕشی پیشەسازی چووە نێو قۆناغی سێ، کە خۆی لە شۆڕشی زانیاری و مەعریف دەنوێنێ و بەشێوەیەك بڵاو بۆوە کە عەقڵی مرۆڤ باوەڕ ناکات.

پێویستی ئەو سیستەمە نێودەوڵەتیەی کە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمی (پاش ساڵی١٩٤٥ ) بە بنەماکانی سیستەمی نوێی جیهان راگەیەنرا، کە گرنگترین روخسارەکانی بریتیبوو لە :

١- روونی دیاردەی پشت بەستنی نێودەوڵەتی و ئەو دابەشکردنی نوێیەی وڵاتان بۆ کارکردن.

٢- کێشەو دۆزە گرنگەکانی جیهان سیمایەکی نێودەوڵەتی و جیهانیان وەرگرت.

٣- ئەو گۆڕانە گەورەیەی بەسەر چەمکە کۆنەکەی بنەمای سەروەری نیشتمانی داهات.

٤- تەقینەوەی شۆڕشی زانیاری و تەکنۆلۆژیا، کە شۆڕشێکی گەورەی لە بوارەکانی گەیاندن و گواستنەوەی زانیاری و خێرایی ئاڵوگۆڕکردن داهێنا.

٥- پشت بەستن بە کۆمەڵبەستە ئیقلیمیەکان کە شێوازێکی ململانێ و کێبڕکێیان لە نێواندایەو نەگەیشتۆتە ئاستی دژایەتیکردن.

بەمجۆرە جیهانگیری وادەردەکەوت کە پێشکەوتنێك لە کۆنترین سەردەمەکانی مێژووەوەپلانی بۆ دانراوە، واتە ئەم پرۆسەیە درێژە

پێدەرێکی مێژووی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی ئێستای جیای دەکاتەوە لە پێشتر ئەو چڕی ئاڵوگۆڕ کردن خێرایی تەشەنەکردنێتی لەنێوان وڵاتان، ئەمەش لەسایەی تەشەنەکردنی شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنەکانە.

## خەسڵەتەکانی جیهانگیری ئابووری:

تێڕوانین لە ناوەڕۆکی بیری و هەتا مێژووییەکەی جیهانگیری، چەند خەسڵەتێکی سەرەکی هەیە کە جیهانگیری پێ لە زاراوەکانی دیکە خاوەن گۆڕانکارییە ریشەییەکان جیادەکاتەوە، گرنکترین ئەو خەسڵەتانە بریتین لە:

### ١- دەستگرتن بەسەر میکانیزمی بازاڕ و هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی توانای کێبڕکێی:

ئەوەی کە جیهانگیری جیادەکاتەوە ئەوەیە دەست بەسەر میکانیزمی بازاڕ و تێکەڵکردنی لەگەڵ دیموکراتیەتە، لەجیاتی سەرپاگیری و بڕیاردان لەچوارچێوەی کێبڕکێ و نموونەیی ولێهاتووی تەواو و وەرگرتنی توانای کێبڕکێکردن لەرێگەی سوود وەرگرتن لە شۆڕشی تەکنەلۆژی و شۆڕشی پەیوەندیکردن و گواستنەوەو زانیارییەوە بەدەست دەهێنرێت، بەهێزکردنی ئەم توانایە لەبەرهەمهێنان بەکەمترین تێچوون کە هەیەو بە باشترین شێوەو بە زۆرترین بەرهەم و فرۆشتنی بە نرخی کیبڕکێی گونجاو.

هەموو ئەمانەش پێویستە بەکەمترین کات و ماوە ئەنجام بدرێن، کات بۆتە یەکێك لە تواناکانی کێبرکی گرنگ کە دەبێت لە کاتی مامەڵەکردندا لەگەڵ جیهانگیری بەدەستی بهێنیت، بۆیە جیهان دەبێتە گوندێکی بچووکی

کێبڕکێـی هەمـە لایـەن و شـێوازی دابەشـکردنی کـاری نێودەوڵـەتی تێـدا دەگۆڕێت، کە لەگەڵ بەرهەمهێنان یاخود جیهانییەتی بەرهـەم و جیهانییـەتی بازاڕ بگونجیت.

بەمشێوەیە هەموو کەرت و بەشێك لە پێکهاتەکانی بەرهەمهێنانی شمەکێك لە جێگە و شوێنێکی جیاوازی جیهان بەرهەم دەهێنرێت، وا دەکات بڕیارەکـانی بەرهـــەم و ســـەرمایەگوزاری لـــە تێڕوانینـــی جیهانییـــەوە دەدرێـــت، بـــە لەبەرچاوگرتنی ئـابووری پێگەیشتوو لـەو بـوارەی پەیوەنـدی بـە تێـچوون و داهاتەوە هەیە.

## ٢- دینامیکییەتی چەمکی جیهانگیری:

زۆرینەی ئەو پێناسانەی تایبەت بە جیهانگیری ئاماژە بە دینامیکییەی جیهـانگیری دەکـات. کـە رۆژ لـە دوای رۆژ زیـاتر دەچەسـپێت بـە بەڵگـەی ئەگەرەکانی گۆڕانی هاوسەنگییەکانی هێـزی ئـابووری لـە ئێـستا و دوا رۆژدا، بە شـێوەیەك لـە کێبرکێـدا هـەموو رووبـەڕووی یـەکتر دەبنـەوە، لـە ناویانـدا (ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمـەریکا) کـە بـە هـەموو هێـز و توانایـەوە هـەوڵی دەست بەسەرداگرتنی تواناکانی کێبرکێ دەدات، بـۆ ئـەوەی بتـوانێ کێبرکـێ لەگەڵ سەرجەم لایەنە دەرکەوتووەکانی بکات گۆرەپانەکە کە هەنگاوی خێرا بەرەو دوارۆژ دەنێن وەکو چین.

دینامیکییەتی جیهانگیری بەوە قووڵتر دەبێتەوە، کاتێـك جیهـانگیری هـەوڵی هەڵگرتن و لابردنی سنوورە سیاسییەکان دەدات و بەزۆری کاریگەری لەسـەر رۆڵی دەوڵەت لە چالاکی ئابووریدا دەبێـت، بـەڵکو دینامیکییـەی جیهـانگیری کاتێك ئاکامی کێشە و ململانێکان یەکلا دەکاتەوە ئەوکات بەدیار دەکـەوێت،

لـە ئـەو دژە کاردانـەوەی کـە لەلایـەن سـوودمەندەکانی بـارودۆخی ئـەمڕۆی ئابووری ڕوودەدات، کە بە هەموو شـێوەیەك هـەوڵی پاراسـتنی دەسـکەوت و بەرژەوەندییـــەکانیان دەدەن. هاوکـــات کاردانـــەوەی دژایـــەتیکردنی دۆڕاوەکانیش لە بارودۆخەکە بە تایبەت وڵاتانی تازە پێگەیشتوو هەوڵدەدەن لەڕێگەی کۆمەڵبەست و یەکگرتنیان بەرگری لـە بەرژەوەندییـەکانیان بکـەن، ئەم حاڵەتەش لە پێنجەمین کۆبوونەوەی ڕێکخراوی بازرگانی نێودەوڵـەتی لـە مەکسیك ( ساڵی ٢٠٠٣ ) بەدیارکەوت.

## ٣- زۆربوونی ئاراستەی پشت بەستن بە ئابووری ئاڵوگۆڕکردن:

ئەو ئاراستەیەی بەرەو پشت بەستن بە ئـاڵوگۆڕکردن قـووڵ دەبێتـەوە (Interdependce)لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لـە دەیـەی نـەوەدەکان (عقـد التـسعينات) ڕوویانـدا پـاش ڕێککەوتننامـەی ئـازادکردنی بازرگـانی و زیادبوونی سەربەستی هاتووچۆی سـەرمایەی نێودەوڵـەتی، ئەمـەش هاوکات بـوو لەگـەڵ شۆڕشـی زانیـاری و تەکنـەلۆژیا، کـە لـە سـایەی جیهانگیریـدا ئاستەنگ و بەربەستی دووری نێوان وڵاتان و کیشوەرەکان نامێنێت، لەگـەڵ زیـادبوونی ئەگـەرەکانی کـارلێکردنی بەرامبـەر و دۆزینـەوەی جۆرێـك لـە دابەشکردنی کاری نێودەوڵەتی، کە پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی نێوان وڵاتان دابەش دەبێت.

## ٤- گەورەبوونی ڕۆڵی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان:

جێی ئاماژە پێدانە کۆمپانیا فرە رەگەزەکان کۆمپانیای چالاکییە جیهانییەکانن، بە هەموو واتایەك بە یەکێك لەسیما سەرەکییەکانی جیهانگیری دادەنرێت، لە رێگای ئەو چالاکییانەی دەیکات لە شێوەی سەرمایەگوزاری راستەوخۆ لە گواستنەوەی تەکنەلۆژیا کاریگەری زۆر بەهێز دەکاتە سەر ئابووری جیهان و شارەزایی وەبازارخستن و کارگێری، و جەختکردنی دیاردەی جیهانگیری لە سەرجەم بوارەکانی بەرهەمهێنان و دارایی و تەکنەلۆژیا و بازاڕ و کارگێری.

سەرەڕای ئەوانەش ئەو کۆمپانیا گەورە خاوەن توانا زۆرەکانی پارەدارکردن، رۆڵێکی کاریگەر لەو شۆڕشە تەکنەلۆژیا دەگێڕن وتوانیویانە هونەری بەرهەمهێنان بگۆڕن بە هونەرێکی بەرهەمهێنانی ئالۆز و پڕ لە زانیاری، بۆیە لەم روانگەیەوە ئاراستەکانی بەرەو جیهانگیرییە بە تایبەت جیهانگیری ئابووری.

## ٥- زۆربوونی رۆڵی رێکخراوە ئابوورییە جیهانییەکان لە بەڕێوەبردنی جیهانگیریدا:

یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی جیهانگیری بریتییە لە زیادبوونی رۆڵی رێکخراوە ئابوورییە جیهانییەکان لە بەڕێوەبردنی جیهانگیری، بە تایبەت لە دوای روخانی بلۆکی سۆشیالیستی و لێك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، کە رێکخراوە ئابوورییەکانی ئەم بلوکە هەڵوەشانەوە و رۆڵیان نەما،لە ساڵی ١٩٩٥ رێکخراوی بازرگانی جیهانی دامەزرا و زۆرینەی وڵاتانی جیهان بوون بە ئەندامی، ئینجا کۆڵەکەی سێیەم دەزگاکانی سیستەمی

ئابووری جیهانی تەواو بوو کە جیهانگیری گرنگترین سیماکانیەتی، بەم جۆرە لـە بـەڕێوەبردنی جیهـانگیری سـێ ڕێکخـراوی سـەرەکی هەیـە، لـە ڕێگـای سیاسەتە نەختینەیی و دارایی و بازرگانییەکان کاریگەییان لە سەر سیاسەتی ئابووری سەرجەم وڵاتانی جیهان دەبێت کە ئەوانیش:

١- سندوقی نەختی نێودەوڵەتی.
٢- بانکی نێودەوڵەتی و بەشەکانی.
٣- ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی.

## ٦- کەمکردنەوەی پلەی سەروەری دەوڵەتی نەتەوەیی و لاوازکردنی سەروەری نیشتمانی لە بواری سیاسەتی نەختینەیی و داراییدا.

جیهـانگیری بـەوە ناسـراوە کـە سـەروەری دەوڵـەتی نەتـەوەیی لاواز کردووە، بەتایبەت بـووە هـۆی بێهێزکردنـی سـەرمایەی نیشتمانی لـە بـواری سیاسەتی نەختی و دارایی، کە حکومەتەکان لە زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهان ناچار بوون دەسـتبەرداری یاسـاکانی کۆنترۆڵکردنی بازاڕەکـان بـن و یاسـای بازاڕی ئازاد پەیڕەو بکەن، تەنانەت پێش ئـەوەی ڕێگـا و شـێوازی چـاودێری نوێش بدۆزنەوە.

هەروەك ئەزموونەکان دەریان خستووە بڕیار بە دەستانی سیاسەتی ئابووری توانایـان نییـە لەگـەڵ ئاراسـتەکردنی بـازاڕە داراییـەکان بەتـەواوی کەسـێ سیاسەت لەیەك کاتدا پەیڕەو بکەن، ئەویش نرخی ئاڵوگۆڕی جێگیر و ئازادی جموجۆڵی سەرمایە و بەرزکردنەوەی نرخی سووەکانی نـاوخۆی مـاوە کـورت بە جیاوازییەکی نرخی سوویی جیهانی کورت خایەن.

بە کورتی: لەگەڵ بەرەو پێش چوونی بەرەو جیهانگیری، رۆڵی لە بەرژەوەندی هێزی جیهانگیری لە دروستکردنی سیاسەتی ئابووری نیشتمانی کەم دەبێتەوە لەوانەش دیاریکردنی تێکڕای سەرمایەگوزاری و گەشەی ئابووری و ئاستی بەکارخستن و بێکاری و ئاستی داهات و یاخود خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و بوژانەوە یاخود بێبزاوتی بازاڕە داراییەکان و نرخی ئاڵوگۆڕی دراوی نیشتمانی.

## جۆرەکانی جیهانگیری ئابووری:

کە لێکۆڵینەوە لە سەر جیهانگیری ئابووری دەکرێت، دەبینین جیهانگیری لەسەر دوو ئاستی سەرەکی روودەدات:

**ئاستی یەکەم:** بە شێوەیەکی بەهێز لە بواری بەرهەمهێنان دەردەکەوێت و پێدەوترێت جیهانگیری بەرهەم کەپشت بەدوو ئاراستەی بنەڕەتی دەبەستێت:

١- جیهانگیری بازرگانی نێودەوڵەتی و رێککەوتنی ئازادکردنی بازرگانی نێودەوڵەتی، ئەمەش رەنگدانەوەی بەسەر گەشەکردنی بازرگانی نێودەوڵەتی خێرا دەردەکەوێت.

٢- وەبەرهێنانی بیانی راستەوخۆ کە تێکڕای زیادبوونی خێراترە لە تێکڕای گەشەی بازرگانی نێودەوڵەتی.

**ئاستی دووەم:** کە جیهانگیری ئابووری تێدا روودەدات لە بواری جیهانگیری دارایی کە خۆی لە گەشەکردنی خێرای مامەڵە داراییە نێودەوڵەتییەکان دەبینێت لەئاکامی ئازادکردنی دارایی دەکەوێتەوە، کۆمپانیا فرەرەگەزەکان رۆڵێکی گەورەیان هەیە لە تەواوکاری بازاڕە

جیهانییەکان لە بواری شمەك و بەرەو پێش چوونی شۆڕشی تەکنەلۆژیا و تەواوکاری سیستەمی پەیوەندییەکان رۆڵێکی مەزن دەگێڕێت لە قوڵکردنەوەی جیهانگیری و گەورەبوونی شۆڕشی تەکنەلۆژیا و گەیاندن، کە دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە باسی بکەین:

## یەکەم : جیهانگیری بەرهەمهێنان :

جیهانگیری بەرهەمهێنان بە رێژەیەکی زۆر لە رێگای کۆمپانیا فرەرەگەزەکان و بەبێ قەیرانی مەترسیدار بەدی دێت، جیهانگیری بەرهەمهێنان شێوازی نوێ لە دابەشکردنی کاری نێودەوڵەتی دروست دەکات، ئەم حاڵەتە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە سروشتی بەرهەمهێنانی پیشەسازیدا بە دیار دەکەوێت، دەوڵەتێك چەند پێشکەوتوو بێت ناتوانێت لە یەك جۆر بەرهەمهێنان بە تەواوی پسپۆربێ بۆ نموونە ئوتۆمبێلەکان لە چەند دەوڵەتێك پارچەکانی کۆ دەکرێتەوە و بەرهەم دەهێنرێت، ئامێرە کارەباییەکانیش بە هەمان شێوە و کۆمپیوتەر و ئامێری تەکنەلۆژیا لە چەند وڵاتێك بەرهەم دەهێنرێت و بەشەکانی کۆدەکرێتەوە، تاکو وای لێهاتووە هەریەك لە وڵاتان پسپۆرایەتی لە جۆرێك لە بەشەکان و پێکهاتەی سەرەکی بەرهەمەکەیان دەبێت. لەم چوارچێوەیەدا بڕیارەکانی بەرهەمهێنان و بڕیارەکانی سەرمایەگوزاری لە تێڕوانینی جیهانییەوە دەدرێت و بەپێی حساباتی وردی ئابووری رەچاوی تێچوون و داهات دەکرێت. ئەم بارودۆخە هەلێکی گەورەی بۆ زۆرترین وڵاتانی تازە پێگەیشتوو دروست کرد، کە دەتوانن سوودی لێوەربگرن و بچنە ناو بازاڕی جیهانییەوە لە سایەی جیهانگیری بەرهەمهێنانەوە وبەشداری لە زۆربەی بەرهەمەکاندا بکەن.

## ١- ئاراستەی یەکەم :جیهانگیری بازرگانی نێودەوڵەتی:

دەتوانین ئەم ئاراستەیە لە نیشانە تایبەتییەکانی بازرگانی نێودەوڵەتییەی تێبینی ئەوە بکەین:

أ — لە دەیەی نەوەدەکانی سەدەی بیستدا بازرگانی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی گەورە و فراوان زیادیکرد، بەشێوەیەك گەشەی بازرگانی جیهانی دوو هێندەی گەشەی بەرهەمهێنانی ناوخۆیی سەرجەم جیهانی لێهات لە ساڵی ١٩٩٥ بەرهەمی ناوخۆیی سەرجەم جیهان بە ڕێژەی ٥٪ زیادیکرد، لە کاتێکدا ڕێژەی گەشەی بازرگانی لە هەمان ساڵدا بە ڕێژەی ٩٪ زیادیکرد.

ب — زیادبوونی تێکرای بازرگانی شمەکی نێو دەوڵەتی، کە تێکڕای ناوەندی گەشەی بازرگانی نێودەوڵەتی لەشمەك وخزمەتگوزاری بۆ ساڵی ٢٠٠٠ بەراورد بەساڵی ١٩٩٩ بە ڕێژەی ٢،١١٪ زیادیکرد ئەمەش بەبەهای ٧٧٥٩ ملیار دۆلار، لە کاتێکدا بەرهەمی ناوخۆیی سەرجەم جیهان لە ساڵی ٢٠٠٠ بە بەهای ٣١١٧١ ملیار دۆلار بەڕێژەی گەشەی ٧،٤٪ بە بەراورد بە ساڵی ١٩٩٩ تۆمارکراوە. واتە بازرگانی نێوەدەوڵەتی شمەك و کەلوپەلەکان بە ڕێژەیەکی زیاتری گەشەی بەرهەمی ناوخۆیی سەرجەم جیهان دوو هێندە و نیو زیادیکردووە.

## ٢- ئاراستەی دووەم :سەرمایەگوزاری بیانی راستەوخۆ:

لەسایەی بنەمای نوێی دابەشکردنی کاری نێو دەوڵەتیدا کە کرداری بەرهەمهێنانی یەك جۆر شمەك بەسەر چەند وڵاتێکدا دابەش دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە کۆمپانیا فرە رەگەزەکان ستراتیژییەتی بەرهەم و بە بازارخستنی دادەڕێژن، کە جیهان بە یەك بازاڕ دادەنێن و ڕۆڵی هەریەکە لە پرۆسەی بەرهەمهێنان بە پێی بەرنامە و پلانی کۆمپانیاکان دیاری دەکرێت.

ئاستی گەشەی سەرمایەگوزاری راستەوخۆی بیانی بە رێژەیەکی خێراتر و گەورەتر زیادی کرد لەچاو گەشەی بازرگانی نێودەوڵەتی و جیهانی، رێژەی گەشەی سەرمایەگوزاری راستەوخۆی بیانی لە نەوەدەکانی سەدەی بیستدا بە تێکرای ١٢٪ زیادیکرد، کۆمپانیا فرەرەگەزەکان بەو پەڕی توانایانەوە سەرۆکایەتی ئەم ئاراستەیەیان کرد، تا وەکو پشتگیری زیاتری جیهانگیری بکەن، کە لە ئاکامدا چەندین هاوپەیمانێتی ستراتیژی لە نێوانیاندا دروست بوو، شوێنەوارەکانیش لە سەرجەم بوارەکاندا دیاربوو بە تایبەت لە بواری تەکنەلۆژیا و بازاڕەکاندا.

لەلایەکی دیکەوە ئەو پێشکەوتنە گرنگەی کە لە سەرمایەگوزاری راستەوخۆی بیانی لە نیوەی دووەمی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم روویدا، بەشێکی گەورەی لێشاوی ئەو سەرمایەگوزارییە لە پرۆسەی یەککگرتن و تێکەڵبوون بەرهەم هات.

ئەوەی لەم بوارەدا تێبینی دەکرێ مەبەستی یەککگرتن و تێکەڵبوون بەرێی سنوور دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی کۆمپانیا فرەرەگەزەکان لە پەیڕەوکردنی ئەمجۆرە سەرمایەگوزارییە بیانییە راستەوخۆیە، گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ بە دامەزراندنی کۆمپانیای تازە، چونکە کۆمپانیای دایك توانای سوودوەرگرتنی مادی و مرۆیی وبەشەری و تەکنەلۆژیای ئەو کۆمپانیانە رایدەکێشێت و کۆنترۆڵی دەکات، ئەمە جگە لە کەڵکەکانی دابەشبوونی مەترسی و زیادکردنی قەبارەی چالاکییەکانی، کە لە ئاکامدا دەسەڵاتی کێبرکێی کۆمپانیاکە لە سەر ئاستی جیهانی فراوانتر دەکات، بەمجۆرە رۆڵی کۆمپانیا فرەرەگەزەکان کە زۆربەی کاتدا بە لێشاو دەرژێتە ناو وڵات لە دەوڵەمەندکردنی جیهانگیری بەرهەم قووڵتر و بە هێزتر دەبێت.

## دووەم - جیهانگیری دارایی:

جیهانگیری دارایی بریتییە لە بەرهەمی سەرەکی کرداری ئازادکردنی دارایی و گۆڕانەکە پێی دەگوترێ کرانەوەی دارایی، کە بۆتە هۆی تەواوکاری و بەستنەوەی بازاڕە داراییە ناوخۆییەکان بە جیهانی دەرەوە، ئەمەش لە ڕێگای هەڵوەشانەوەی کۆت و بەربەستی بەردەم جموجۆڵی سەرمایە، کە لە سنوورەکانەوە بە لێشاو دێنە ناوەوەو دەڕژێنە ناو بازاڕە داراییە جیهانییەکان، بە شێوەیەك بازاڕەکانی سەرمایە زیاتر بە یەکترەوە بەستراوەتەوە و تێکەڵاوبووە.

دەکرێت گرنگی و کاریگەری جیهانگیری دارایی بە دوو نیشانە دیاری بکەین:

١ – نیشانەی یەکەم: تایبەتە بە پێشکەوتنی قەبارەی مامەڵەکانی سەر سنوور لە پشك و قەباڵەکان (الاسهم والسندات) لە وڵاتانی پیشەسازی پێشکەوتوو، بەیاننامەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ساڵی ١٩٨٠ مامەڵە دەرەکییەکان لە ١٠٪ کەمتر بووە لە سەرجەم بەرهەمی ناوخۆیی وڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازییەکان، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٦ لە هەر یەك لە ئەمەریکا و ئەڵمانیا گەیشتە ١٠٠٪ و لە فەڕەنسە و ئیتاڵیا و کەنەدا گەیشتە ٢٠٠٪.

٢ – نیشانەی دووەم: تایبەتە بە پێشکەوتنی بەکارهێنانی نەختی بیانی لە سەر ئاستی جیهان، ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن ناوەندی تێکڕای مامەڵە کردن ڕۆژانە لە ناو بازاڕەکانی ئاڵوگۆڕکردنی بیانی تەنیا ( ٢٠٠ ) ملیار دۆلاری ئەمەریکی بووە لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەم کەچی لە ساڵی ١٩٩٥ ئەم ژمارەیە بۆ (١٢٠٠ ) ملیار دۆلاری ئەمەریکی بەرزبۆوە واتە

به ڕێژەی ٨٤٪ ی سەرجەم یەدەگی نێودەوڵەتی سەرجەم وڵاتانی جیهان لەو ساڵەدا زیادیکردووون.

ناوەرۆکی جیهانگیری بازاڕە داراییەکان ئازادکردنی حیسابی سەرمایە، واتە هەڵگرتن و لابردنی گەمارۆ لە سەر مامەڵەکانی ناو حیسابی سەرمایەو دارایی لە تەرازووی پێدان، کە سەرجەم مامەڵە جۆراوجۆرەکانی سەرمایە دەگرێتەوە، وەکو قەرز و پشکی پارێزگاری دارایی (folio Port)و سەرمایەگوزاری راستەوخۆ و خانووبەرە و سامانی تایبەتی و ئازادکردنی ئازادکردنی حسابی سەرمایە، پاشان چۆنیەتی رەچاوکردنی توانای حسابی خاوەن دارایی بۆ ئاڵوگۆڕکردن.

## میکانیزمی جیهانگیری:

هێزە کاریگەرەکانی سەرمایەداری لە سیستەمی نێودەوڵەتی هەوڵدەدەن جیهانگیرییەکی ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و هزری و رۆشنبیری و بگرە سەربازیش لە رێگای کۆمەڵێك میکانیزم و هۆکارەوە بەدی بێنن کەئەمانیش:

دامودەزگای نەختی و دارایی جیهانی (دامەزراوەکانی بریتون وودز)، رێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی (WTO) کۆمپانیا فرەرەگەزەکان (Multinational Companeis)، هاوپەیمانی ناتۆ، مونتەدای ئابووری جیهان (داڤۆس).

بەم شێوەیە دەکرێت بووترێت جیهانگیری ئابووری سێ سیستەمی سەرەکی لە خۆ دەگرێت، سیستەمی نەختی نێودەوڵەتی، و سیستەمی دارایی نێودەوڵەتی، و سیستەمی بازرگانی نێودەوڵەتی، لە رێگای سێ

ڕێکخراوی ئابووری جیهانییەوە ئیداری هەر سێ سیستەمەکە دەکرێت ئەویش بریتییە لە:

**١- سندوقی نەختی نێودەوڵەتی:** International Monetary Fund (IMF)

**٢- بانکی ئاوەدانکردنەوە وگەشە پێدانی نێودەڵەتی:** World Bank (WB)

**٣- ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی:** World Trade Organization(WTO)

ئەم ڕێکخراوانە هەڵدەستن بە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئابووری جیهانگیری، بۆ نموونە سندووقی نەختی نێودەولەتی پسپۆرە لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی نەختینەیی، بەنکی جیهانی تایبەتمەندی لە بواری سیاسەتی دارایی و بەڕێوەبردن هەیە، ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی پسپۆرایەتی لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی بازرگانی جیهانیدا هەیە.

باسکردن و لێکۆڵینەوە لە سەر هەر سێ ڕێکخراوە جیهانییەکە کارێکی پێویستە بۆ شارەزابوون لە میکانزمی بەڕێوەچوونی جیهانگیری ئابووری.

## پرسیارەکانی بەشی حەوتەم

پ١/ پێناسەی ئەمانە بکە:

١- جیهانگیری

٢- جیهانگیری بەرهەمهێنان

٣- جیهانگیری دارایی

پ٢/ جیهانگیری لە ڕێگای سێ قۆناغی سەرەکی گەیشتە ئەم رووخسارە هاوچەرخەی ئێستای، ئەم قۆناغانە چین؟

پ٣/ ئەو سیستەمە نێودەوڵەتیەی دوای جەنگی جیهانی دووەم راگەیەنرا، رووخسارەکانی چی بوو؟ بیانژمێرە.

پ٤/ لەبارەی زۆربوونی ڕۆڵی ڕێکخراوە ئابووریە جیهانیەکان لە بەڕێوەبردنی جیهانگیری بدوێ.

پ٥/ گرنگی و کاریگەری جیهانگیری دارایی بەچی نیشانە دەکرێ.

# سەرچاوەکانی بەشی حەوتەم


١.  بـول هيرسـت، وجراهـام تومبـسون، مـا العولمـة : الاقتـصاد العـالمي وامكانـات التحكم،تعريب الدكتور فالح عبدالجبار، سلسلة عالم المعرفة، العدد ٢٧٣، مطـابع الـسياسة، الكويت، ٢٠٠١.

٢.  د. جلال امين، العولمة والتنمية العربية من حملة نابليون الى جولة اوروغـواي ١٧٩٨ – ١٩٩٨، الطبعة الاولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٩.

٣.  جيريمـي بريتـشير، وتـيم كاسـتيللو، القريـة الكونيـة او النهـب الكـوني : اعـادة البنـاء الاقتصادي من القاعدة الى الاعلى، ترجمة الحارث النبهان، الطبعة الاولى، دار المـدى للثقافـة والنشر، دمشق، ٢٠٠٤.

٤.  د. سناء كـاظم كـاطع، الفكـر الاسـلامي المعاصـر والعولمـة، الطبعـة الاولى، دارالغـدير، بيروت، ٢٠٠٥.

٥.  د. عبدالمطلب عبدالحميـد، العولمـة الاقتـصادية ( منظماتهـا، شـركاتها، تـداعياتها )، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٦.

٦.  د. محسن عبدالحميد، العولمة من المنظور الاسلامي، الطبعة الاولى، دون جهـة للنـشر، دون مكان للنشر، ٢٠٠٢.

٧.  د. محمود خالد المسافر، العولمة الاقتصادية : هيمنة الشمال والتداعيات على الجنوب، الطبعة الاولى، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢.

٨.  ميشيل شوسودوفسكي، عولمة الفقر : تاثير اصلاحات صندوق النقد والبنك الـدوليين، ترجمة : جعفر علي حسين السوداني، الطبعة الاولى، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠١.

9 – Sarah Anderson، Tony Clarke، Colin Hines and others، “Alternatives to Economic Globalization: A Better World Is Possible"، International، Forum On Globalization، Berrett – Kohler Publishers، Inc.، San Francisco، 2002.

# فەرهەنگۆك

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Free Economics | الاقتصاد الحر | ئابووری ئازاد |
| Market Economy | اقتصاد السوق | ئابووری بازاڕ |
| Economies of Scale | اقتصاديات الحجم | ئابووری قەبارەدار |
| Network Economy | اقتصاد المعرفة | ئابووری مەعریفی |
| Directed | التوجيه – الموجه | ئاراستەکردن |
| Desire | الرغبة | ئارەزوو – ویستن |
| Living Level | المستوى المعيشي | ئاستی بژێوی |
| Interdependence | يتعزز التبادل | ئاڵوگور چڕدەبێتەوە |
| Target - Goal | الهدف | ئامانج |
| Tools - Instruments | الادوات | ئامرازەکان |
| Function | الوظيفة | ئەرك – پۆست |
| Financing function | الوظيفة التمويلية | ئەرکی پارەدارکردن |
| Money Functions | وظائف النقود | ئەرکی دراو |
| Money function | الوظيفة النقدية | ئەرکی دراو |
| Fluctuations | التقلب – التارجح | بارگۆڕان – هەڵبەز و دابەز |
| Fluctuations | التقلبات | بارگۆڕان ( وەچەرخان ) |
| Trade ( Business ) Cycle | الدورة الاقتصادية | سوڕی (خولی) ئابووری |
| The Labour Conditions | ظروف العمل | بارودۆخی کار |
| The Markets | الاسواق | بازاڕەکان |
| Free Competition Market | سوق المنافسة التامة | بازاڕی کێبڕکێی تەواو |
| Internationalization | العالمية | بەجیهانیبوون |
| Implementation | الانجاز | بەدەست هاتوو |
| Available | المتاح | بەردەست |
| Producers | المنتجين | بەرهەمهێنەران |
| Full Employment | الاستخدام الكامل | (بەکارخستنی تەواو ) |
| Consumers | المستهلكين | بەکارهێنەران |
| Banks | البنوك | بەنکەکان |
| Trade Banks | البنوك التجارية | بەنکی بازرگانی |
| Central Banks | البنوك المركزية | بەنکی ناوەندی |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| World Bank for Reconstruction & Development | البنك الدولي للتعمير و التنمية | بەنکی نێودەوڵەتی بۆ ئۆژەنکردنەوە و پەرەپێدان |
| Value and the Price | القيمة والسعر | بەها و نرخ |
| Value In Exchange | القيمة التبادلية | بەهای ئاڵوگۆڕکردن |
| Value In Use | القيمة الاستعمالية | بەهای بەکارهێنان |
| Choice | الخيار | بژاردە |
| Basis - Basics | الاسس / القواعد | بنەما – ڕێسا |
| The Factors Of Production | عناصر الانتاج | بنەماکانی بەرهەمهێنان |
| Recession | الركود | بێ بزاوتی |
| Justifiucation | تبرير | بیانوو |
| Theory | النظرية | بیردۆزە |
| Demand –Shift Theory | نظرية تحول الطلب | بیردۆزە گواستنەوەی داخواست |
| Inflation Theories | نظريات التضخم | بیردۆزەکانی هەڵاوسان |
| Cost– Push Theory | نظرية دفع التكاليف | بیردۆزی تێچوونە پاڵنەرەکان |
| Structural Inflation Theory | النظرية الهيكلية | بیردۆزی پەیکەری |
| Demand – Pull Theory | نظرية جذب الطلب | بیردۆزی ڕاکێشانی داخواست |
| Job Searching Theory | نظرية البحث عن العمل | بیردۆزی گەڕان بە دوای کار |
| Marginal Utility Theory | نظرية المنفعة الحدية | بیردۆزی کەڵکی سنووردار |
| Unemployment | البطالة | بێکاری |
| Voluntary Unemployment | البطالة الاختيارية | بێکاری بە ئارەزوو |
| Cyclical Unemployment | البطالة الدورية | بێکاری بەخول |
| Unemployment Frictional | البطالة الاحتكاكية | بێکاری بەریەك کەوتن |
| Unemployment Structural | البطالة الهيكلية (البنيانية ) | بێکاری پێکەربەند |
| Behavioral Unemployment | البطالة السلوكية | بێکاری ڕەفتاری |
| Disguised Unemployment | البطالة المقنعة | بێکاری شاراوە (ژێر پەردە) |
| Imported Unemployment | البطالة المستوردة | بێکاری هاوردە |
| Seasonal Unemployment | البطالة الموسمية | بێکاری وەرزاو وەرز |
| Neutral | المحايد – الحيادي | بێلایەن |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Insurance | التامين | بیمه |
| Characteristics | الخصائص | تایبەتمەندی |
| Money Characteristics | خصائص النقود | تایبەتمەندییەکانی دراو |
| Electronic Funds Transfers ( EFT) | التحويلات المالية الالكترونية | تەحویلاتی دارایی ئەلیکترۆنی |
| Balance Of Payments | ميزان المدفوعات | تەرازووی پێدراوەکان |
| Allocation | التخصيص | تەرخانکردن |
| Effeciency | الكفاءة | توانست–لێهاتوویی |
| Economic Effecincy | الفاعلية الاقتصادية | توانستی ئابووری |
| Searching - Research | البحث | توێژینەوە |
| Costs | التكاليف | تێچوونەکان |
| Classification | التصنيف | پۆلین |
| Motives- Motivation | الدافع | پاڵنەر |
| Engine of growth | المحرك للنمو | پاڵنەری گەشەکردن |
| Relationship | العلاقة | پەیوەندی |
| Quantitive Relationship | العلاقة الكمية | پەیوەندی برِداری (چەندێتی) |
| Operation - Process | العملية | پرۆسە – کردار |
| Application | التطبيق | پراکتیزکردن |
| Interdependence | الاعتماد المتبادل | پشت بەستنی ئاڵوگۆڕکاری |
| Planning | التخطيط | پلاندانان – نەخشەدانان |
| Wants ( Needs ) | الحاجات | پێداویستیەکان |
| Holy | مقدس | پیرۆز |
| Expect - Predict | التوقع – التنبؤ | پێشبینیکردن |
| Recommendation | المقترح – المقترحات | پێشنیاز – پێشنیار |
| Criteria - Standard | مقياس، معيار | پێوەر (پێوانە) |
| The Types Of Markets | اشكال السوق | جۆرەکانی بازاڕ |
| Types of Unemployment | انواع البطالة | جۆرەکانی بێکاری |
| The Types of inflation | انواع التضخم | جۆرەکانی هەڵاوسان |
| Portfolio | المحافظ المالية(الاستثمارية ) | جافانی دارایی |
| Excution - Excute | التنفيذ | جێبەجێکردن |
| Alternatives | البدائل / البديل | جێگیرەکان |
| Globalization | العولمة | جیهانگیری |
| Preferring | التفضيل | حەزکردن |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Welfare | الرفاهية | خۆشگوزەرانی |
| Expenditure - Spend | الانفاق | خەرج – خەرجکردن |
| Services | الخدمات | خزمەت – خزمەتگوزاری |
| Supply | العرض | خستنەڕوو |
| Tables - Scheduales | الجداول | خشتە |
| Study | الدراسة | خوێندنەوە |
| Intra - Firm | تقسيم العمل في المنتج او السلعة الواحدة | دابەشکردنی کار لە ناو یەك جۆرە شمەکدا |
| Intra - Industry | تقسيم العمل في الصناعة الواحدة | دابەشکردنی کار لە ناو یەك جۆری پیشەسازیدا |
| Distribution | التوزيع | دابەشکردن |
| Financial Resources | الموارد المالية | دەرامەتە داراییەکان |
| Natural Resources | الموارد الطبيعية | دەرامەتە سروشتیەکان |
| Human Resources | الموارد البشرية | دەرامەتە مرۆڤییەکان |
| Intervien | التدخل | دەستێوەردان |
| Scarcity - Scarce | الندرة / النادرة | دەگمەنی – کەم |
| Conflict | متعارض | دژ بەیەك |
| Money | النقود | دراو |
| Money as a medium of exchange | النقود وسيطاً للتبادل | دراو وەك ناوەندێکی ئاڵوگۆڕکردن |
| Money Deposits | نقود الودائع | **دراوی ( دراوە سپاردەکان ) بەنکی** |
| Electronic Money | النقود الالكترونية | دراوی ئەلیکترۆنی |
| Plastic Money | النقود البلاستيكية | دراوی پلاستیکی |
| Full bodied money | النقود القياسية ( نقود ذات مادة كاملة ) | دراوی پێوەری |
| Digital or E – Money | النقد الرقمي | دراوی ژمارەیی |
| Commodity Money | النقود السلعية | دراوی شمەکی |
| Paper Money ( Banknote ) | النقود الورقية | دراوی کاغەزی |
| Metal Money | النقود المعدنية | دراوی کانزایی |
| Credit Money | النقود الائتمانية | دراوی متمانە |
| Defferentiation | المفاضلة | جیاکاری |
| Redistribution | اعادة التوزيع | دووبارە دابەشکردنەوە |
| Actors | الفاعلين | کارکەران |
| Exposure | التعرض | دووچار |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Economic Rationality | العقلانية | ژیری |
| Rationality | العقلانية – الرشادة | ژیری |
| Labour Unions The Role Of | دور نقابات العمال | ڕۆڵی سەندیکاکانی کرێکاران |
| Adjustment | التعديل – التسوية | ڕاست کردن – چارەسەر |
| Behavior | السلوك | ڕەفتار |
| Obsulute | المطلق | ڕەها |
| Transfers | تحويلات | ڕەوانەکراوەکان |
| Events | الاحداث | ڕووداوەکان |
| World Trade Organization | منظمة التجارة العالمية | ڕێکخراوی بازرگانی جیهان |
| Organization - Entrepreneur | التنظيم - المنظم | ڕێکخستن – ڕێکخەر – ڕێکخراو |
| Concept | المصطلح – الاصطلاح | زاراوە |
| Economics | علم الاقتصاد | زانستی ئابووری |
| Informations | المعلومات | زانیارییەکان |
| Data | البيانات | زانیاریی ژمارەیی (داتا) |
| Land | الارض | زەوی |
| Resources | الموارد | سامانەکان |
| Liberalism | الليبرالية – التحرر | سەربەخۆیی – ئازادی |
| Recent | المعاصر | سەردەم |
| Capital | راس المال | سەرمایە |
| Productive Capital | راس المال الانتاجي | سەرمایەی بەرهەمهێن |
| Revenue Capital | راس المال الايرادي | سەرمایەی داهات |
| Real Capital | راس المال الحقيقي | سەرمایەی ڕاستەقینە |
| Monetary Capital | راس المال النقدي | سەرمایەی نەختینی |
| International Monetary Fund | صندوق النقد الدولي | سندووقی دراوی نێو دەوڵەتی |
| Marginal / Flexible | الحدية / الحدي | سنووردار – سنوورەکی |
| Interest | الفائدة | سوو |
| Economic Policy | السياسة الاقتصادية | سیاسەتی ئابووری |
| Foreign Trade Policy | سياسة التجارة الخارجية للدولة | سیاسەتی بازرگانی دەرەکی |
| Fiscal Policy | السياسة المالية | سیاسەتی دارایی |
| Fiscal & Expenditure Policy | السياسة المالية والانفاقية | سیاسەتی دارایی و خەرجی |
| Monetary Policy | السياسة النقدية | سیاسەتی نەختینەیی |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Monetary Policy | السياسة النقدية | سیاسەتی نەختینی |
| Mixed Economic System | النظام الاقتصادي المختلط | سیستەمی ئابووری تێکەڵاو |
| Capitalism Economic System | النظام الاقتصادي الراسمالي | سیستەمی ئابووری سەرمایەداری |
| Socialist Economic System ( Planned or Directed ) | النظام الاقتصادي الاشتراكي ( الموجه، او المخطط ) | سیستەمی ئابووری سۆسیالیستی (ئاراستەکراو، یا پلاندار) |
| Natural Law | النظام الطبيعي | سیستەمی سروشتی |
| Skills | المهارة | شارەزایی – کارایی |
| Barter | المقايضة | شت بەشت – گۆرینی شمەك بە شمەك |
| Analyses | التحليل | شرۆڤەکرن – شیکردنەوە |
| failure | الفشل | شکستهێنان ( نووچدان ) |
| Commodity - Good | السلعة | شمەك |
| Economical Effects | الاثار الاقتصادية | شوێنەواری ئابووری |
| Social & psychology Effects | الاثار الاجتماعية والنفسية | شوێنەواری کۆمەلایەتی و دەروونییەکان |
| Formula | الصيغ الرياضية | شێوازی بیرکاری |
| Automotive | بصورة ذاتية | شێوەیەکی خۆیەکی |
| Economic Activities | الانشطة الاقتصادية | چالاکییە ئابوورییەکان |
| Activities | الانشطة | چالاکییەکان |
| Control | الرقابة | چاودێریکردن |
| Stabilization | التثبيت – الاستقرار | چەسپاو(سەقامگیر) |
| Chiques | الشيكات او الصكوك | چەك |
| The Concept of Value | مفهوم القيمة | چەمکی بەها |
| Frame – Framework | الاطار | چوار چێوە |
| Variables | المتغيرات | گۆڕاوەکان |
| Progress - Advancement | التطور | گەشەسەندن – پێشڤەچوون |
| Importance | اهمية | گرنگی |
| Profit | الربح | قازانج |
| Multi National Companies | الشركات المتعدية القومية اوالجنسية | کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان |
| Labour | العمل | کار |
| Credit Cards | البطاقات الائتمانية | کارتی متمانە |
| Effect | تاثير | کارتێکرن |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Effect | التاثیر | کاریگەری |
| Multiplier effect | اثر المضاعف | کاریگەری دووهێندە |
| Private Sector | القطاع الخاص | کەرتی تایبەت |
| Public Sector | القطاع العام | کەرتی گشتی |
| Personal - Individual | الفردیة او الشخصیة | کەسایەتی – تاکرەوی |
| Accumulation | التراکم / یتراکم | کەڵەکەبوون |
| Advantage - Utility | المنفعة | کەڵك |
| Rent | الایجار | کرێی خانوبەرە |
| Wage | الاجر | کرێی کار |
| Lack | قصور | کورتهێنان |
| Competition | المنافسة | کێبڕکێ – ڕکابەرایەتی |
| Problems - Issues | المشاکل | کێشە – گرفتەکان |
| Logic | المنطق | لۆژیك (بیرسا) |
| Special Drawing Rights | حقوق السحب الخاصة | مافی ڕاکێشانی تایبەت |
| Long Run | الاجل الطویل | ماوەی درێژ خایەن |
| Purpose | الغرض | مەبەست |
| Conditions | الشرط – الشروط | مەرج – مەرجەکان |
| Credit | الائتمان | دڵنیایی |
| Ownership | الملکیة | موڵکداری |
| Elasticity - Flexible | المرونة– المرن | نەرمی – نەرمی نواندن |
| Price | السعر | نرخ |
| Price Maker | صانع للسعر | نرخ دروستکر |
| Price Taker | متلقي للسعر | نرخ وەرگر |
| Equilibrium Price | سعر التوازن | نرخی هاوسەنگی |
| Dumping | الاغراق | نقووم بوون |
| In put – Out put models | نموذج المستخدم المنتج | نموونەی بەکارهێنراوی – بەرهەمهێن |
| Political Factors | العوامل السیاسیة | هۆکارە رامیارییەکان |
| Social Factors | العوامل الاجتماعیة | هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان |
| Causes Of Unemployment | مسببات البطالة | هۆکارەکانی بێکاری |
| Accomodating Payments | مدفوعات الموازنة | هاوسەنگی پێدراوی |
| Equations | المعادلات | هاوکێشەکان |
| Inflation | التضخم | هەڵاوسان |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Creeping Inflation | التضخم الزاحف | هەڵاوسانی خشۆك |
| Stagflation | التضخم الركودي | هەڵاوسانی داكێشراو |
| Suppressed Inflation | التضخم المكبوت | هەڵاوسانی شاراوە |
| Hyper Inflation | التضخم المفرط او الطليق | هەڵاوسانی لەرادەبەدەر |
| Selections | اختيارات | هەڵبژاردەكان |
| Selection | الاختيار | هەڵبژاردن |
| Physical | القوة الجسدية | هێزی جەستەیی |
| Mental | القوة الذهنية | هێزی زەینی |
| Labor Force | القوى العاملة | هێزی كار |
| Aware | الوعي | وشیاری |
| | | |
| | | |
| | | |

# لیستی کورتکراوەکان

| زاراوە بە زمانی | | کورتکراوە |
| --- | --- | --- |
| کوردی | ئینگلیزی | |
| ناوەندی تێچوون | Average Cost | AC |
| ناوەندی داهات | Average Revenue | AR |
| داخواست – چەماوەی داخواست | Demand Curve،Demand | DD |
| گرێبەستەی گشتی بۆ تاریفەکان و بازرگانی | General Agreement for Tarrifs & Trade | GATT |
| ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی | International labour Organization | ILO |
| سندووقە دراوی نێودەوڵەتی | International Monetary Fund | IMF |
| تێچوونی سنووردار | Marginal Cost | MC |
| داهاتی سنووردار | Marginal Revenue | MR |
| کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان | Multi National Companies | MNC's |
| نرخ | Price | P |
| بڕ | Quantity | Q |
| مافی ڕاکێشانی تایبەت | Special Drawing Rights | SDR |
| خستنەڕوو – چەماوەیخستنەڕوو | Supply Curve،Supply | SS |
| سەرجەم ناوەندی تێچوون | Total Average Cost | TAC |
| بەرنامەی پەرەپێدانی وولاتە یەکگرتووەکان | United Nations Development Programme | UNDP |
| بەنکی نێو دەوڵەتی | World Bank | WB |
| ڕێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی | World Trade Organization | WTO |

# پێرست


| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| بەشی یەکەم – پێداچوونەوەی گشتی | ٥ |
| بەشی دووەم – بەها و نرخ | ٢٦ |
| بەشی سێیەم – بازاڕەکان | ٤٤ |
| بەشی چوارەم – دراو | ٥٣ |
| بەشی پێنجەم – بانکەکان | ٧٤ |
| بەشی شەشەم – بێکاری | ٩٤ |
| بەشی حەوتەم – جیهانگیری | ١١٣ |